رەنگین

گۆڤارێکی مانگانەی سیاسی گشتی‌یە
دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی
لە وەزارەتی رۆشنبیری‌و راگەیاندن لە بەغداد دەری ئەکات
ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٩٢ز - ١٤١٢ ك


بەڕێوەبەری گشتی
د. بدرخان سندی
سەرنووسەر
محەمەد ئەحمەد محەمەد کەریم

سکرتێری نووسین
ئازاد شوان

دەستەی نووسەران
نوری علی أمین
جەمال خەزنەدار
عبدالرزاق بیمار
ئەنوەر قەرەداخی

دەرهێنانی هونەری
نضال ابراهیم

ناونیشان
بەغداد - الوزیریة
دار الثقافة والنشر الكردیة
بجانب المعهد القضائی

نرخی (٧٥٠) فلسە


## لەم ژمارەیەدا



گۆشە تایبەتی‌یەکانی رەنگین

المدير العام
د. بدرخان السندي

رئيس التحرير
حمه سعيد حمه كريم

رەنگین

مجلة شهرية سياسية عامة
تصدرها دار الثقافة والنشر الكوردية في وزارة الثقافة والاعلام/بغداد
العدد (٤٠) لسنة ١٩٩٢م - ١٤١٢ هـ

# ئەم ئازارو نەورۆزە ئانازیی گەل و هۆزە

●گەلی عیراقی خۆشەویستمان بەکوردو عەرەبەوە یادی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزی کوردیان کردەوە یادی سەربەستیو ئازادییو گەیشتن بە ماف رەوای گەلی کوردیان کردەوە. یادی نەورۆزی کاوەی پالەوان کە گەلی کوردی لە زوڵم زۆرداریو ستەم کاریی زوحاکی خوێن مژ رزگار کرد، یادی جەژنی ١١/ی ئازاریی مێژوویی کە گەلی کوردی گەیاندە ماف رەوای خۆییو بووە خاوەنی ئۆتۆنۆمیو دام و دەزگاو دامەزراوەکانی هەردوو ئەنجوومەنی یاسادانان و راپەراندنی ناوچەی کوردستان.

● ئاشکرایە لەم یادە پیرۆزەی ژیانی گەلەکەمان دا ئەبێ ئەوە دووپات بکەینەوە کە هەمیشەودایم ئاشتیو ئاسایش و گفتووگۆی نێوان گەل باشترین هون بو گەیشتنە ئەنجام و پێك هێنانی هیواو ئاواتەکانی گەلمان و برەو پیدانی هەموو بەندو خالەکانی بەیانی ١١ی ئازار کە تەنها گەشەپێدان و هەوڵی جێبەجێ کردنی ئەوی، کە ئەمەش بە هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزان و خێرخوازانی گەلەکەمان بەکوردو عەرەبەوە ئەنجام ئەدرێت و هەر دەست تێوەر دانێکی بیگانەو خەڵکی لاوەکی لەم مەسەلەیەدا لە بەرژەوەندی هیچ کات و سەردەمێکی نەتەوەکەمان نییەو هەمیشەش حەق وایە نیشتمان پەروەرانی ئەم وڵاتە سەربەرزەمان تەنها خۆ بەخۆ بیر لە ئەنجام دانی ئامانجی پیرۆزی گەلەکەمان بکەنەوەو هەموو پیلان و بەرنامەی ناهەمواری دوژمنان و ئیمپریالیزم پوچەل بکەنەوە.

لە یادی ١١/ی ئازارو نەورۆزی گەلەکەمان دا پیرۆزباییو چەپکە نێرگزی بونداری چیاکانی کوردستان بۆ ئەندازیاری بەیانە مێژووییەکەی ١١/ی ئازار سەرۆك صدام حسین و هەموو گەلمان بە کوردو عەرەبەوە.

پیرۆزبێ ئازار، پیرۆزبێ نەورۆز

















# بەڕێز سەرۆکی فەرماندە سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرکردایەتی هەرێم ئەکات

● بەڕێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین لە هەفتەی رابووردوودا سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرکردایەتی هەرێمی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ی کرد.

●لە کۆبوونەوەکەدا گوێیان لەراپۆتێك دەربارەی چاوپێکەوتنەکانی کە نێردەی عێراقی بە سەرۆکایەی بەڕێز طارق عزیز جێگری سەرۆکی وەزیران لەگەل ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتاندا کردبووی،گرت .

●بەڕێز حاتم حمدان عزاوی سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی و فەریق روکن حسین کامل راوێژگاری بەڕێز سەرۆك کۆمار ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون. . .

# بيرەوەرىێت نەوروزێ

● د. بدرخان سندي ●



...مى نەورور نيزيك دبت ... روژ بو روژ مروف وەسا ب خو نينته ...رى هەچ وەكى ژ دلبەركا پر نەڤين نيزيك دبت ... راستى مروف ...حسيت هزرو هەست و بيريت خو ب دورستى ل سەر كاغەزى ...حسيت ... نەكارە ليدانيت دلا وەرگيرت زمانى پەيڤان ئو بكەتە ...حس ... چونكى نەورور تيكەلەكە ژ كەلەك ناڤان. ژ گەلەك تشتان د ...زدانا مەدا د ويژدانا مروڤى كورد. نەوروز ... روژە ...ژنە. ملەتە بهارە ... هيڤيە ... هاتيە ... جوويە نەورور هەبى يە!!

لەو دەمێ نەوروز نيزيك دبت پاشە روژ ئو پيشەروژ تيكەل دبن، دگەهنە ئيك! كوڤانى ئو خوشانى تيكەل دبن، چەپ ئو راست دبنە ئيك.. بلند ئو نزمى دگەهنە ئيك. .نارين ئو ڤەلورين دبنە سترانەك. .ئيك ستران. .هاوارە دێ چەوا ڤان هوش ئو سوزان كمە وينەيەك. .دێ چەوا هەڤ ل تەڤ كم؟ . .دێ چەوا بتە پەيڤەك؟ هندى ئەز تيمە خو ئەز نەشيم ژ چار نيرينت نەخشەكێ دەركەڤم نەشيم. . ژ بەندو زيندانيت پەيڤەكێ برەڤم ئيك پەيڤ! ئەو ژى (مروڤ)ە، بەلێ مروڤە. .نەوروز مروڤە. . مروڤانەتى يە نەوروز ئەڤينداري يا مروڤى بو مروڤانە، ئو ئەڤينداري يا مروڤان بو مروڤى يە. .

نەوروز لنك خانى يێ مەزن دخزمەتا ڤێ پەيڤێ دابى . . مەم و زين . . چيروكا مروڤاتى يى يە چيروكا پەيوەندى يا مروڤى دگەل مروڤان بى ژ ئالێ هوزاناڤە. .من بيرەوەرى يێت خو دگەل نەوروزێ دا هەنە. گەلەكن بەلێ من نەڤێت ب دريژى بەحس بكم هندە برادەر من بـ (هوزان ڤان)دزانن ئەو دزانن كو من دوستينى يەكا كەڤن دگەل نەوروزێدا هەيە هيش هينگێ ئەز د ژيانا شاگردينى يى دا بيم (قوتابينى يێ)من هينگێ هوزانيت كوردى و عەرەبى ب نەوروزێ گوتينە. .ئو ژئالێ ميژويى ڤە يان وەكى هندەك دبيژن (هەما بو تاريخ)من پێ خوشە ئەز بيژم كو ئيكەم سروود ب نەوروزێ ل بادينا هاتبت گوتن سروودامن بى ئەوا كو تەحسين طەهاى بەرى سالا ١٩٧٠ئاواز كرى ئو ل سالا ١٩٧٠ى بدەنگێ خو يێ زيرين سترانـد ئو ل ئيستكەها بەغدا هاتە بەلاڤ كرن. .ئو ل هەمى درا ئەڤرو بەلاڤە ئەو ژى ئەو سروودا دبيژت:

**نەوروزە گەلى برا**
**نەوروزە هەلكن چرا**

## نەوروزە سالا نيە
## بهارە لهەمى درا

راستى: من نەڤێت ئەز هەمى سروودى لڤيرێ ژ وەرا بيژم چونكى ئەز دبيژم بخو يێ بەلاڤە.

ناڤێ (نەوروزێ)دگەل هوزانێت من دا هاتى يە. . گەلەك جارا من ئەڤ پەيڤە ب كار ئينايە بەلێ پا هوزانا كو من گەلەك پێ خوشە ژ خورا بخوينم ئەوا كو ل سالا ١٩٩٢ێ ئانكو بەرى دو سالا من فەهاندى. .ب ناڤێ (نەوروزا سالا ١٩٩٢ێ)ئو ئەز ئەڤرو خوش حالم وێ هوزانێ ژ وەرا ديسا بەلاڤ بكم:

نەوروزا من چل و شەش سال بورين
هەر ب زيمارم ئەز هەر ب لورين
پار ڤى دەمى تە ژيڤانەك دابى
وەلى برين ماو ئيش نە تەنابى
چ بوتە هلكم نێ چاڤ چرانە
ئەز چ بسوژم دل ئاگر دانە
روحەك مەيێ ماى گەر تە بڤيتن
گورى تە بكم دا دەلال بيتن
نێ كورە بيم نەوروز ژ هيڤى يا
ژ چيروكين بزدياى ژ نيڤى يا

هەر سال رەز دخەملن ب گولان
عاشق تێن دسوژن جەرگ ودلان
ژ خودانێ مەزن ئەو دخازن
تشتەكى ژ كاروانى بزانن
بەلكو كاروان ئيسڤى بيتن
ساخ بيت ئاقيب خوش بيتن
رابتن ژەنگ ژ دلى بێ كەسان
خالى بيت دنيا ژ تەرەسان
خوناڤەك ب نيرگزى دا بيتن
ئەو نيرگزا ژ تيهنا دكيتن
نەوروزامن چل و شەش سال بورين
هەر ب زيمارم ئەز هەر ب لورين
هوزانا من ڤياى تو نائينى
پەيڤين چاڤ مەلينە ناوەشينى
نەوروز تێ نەگەهە من تونەڤيى
تو كەهنى ى ددلێ من دا زيێ
گەر دالاهى يا ئەز ل تە نەكم
كى دێ گول من بت كەتى مەو كەتم
رويبارين دنى نەوروز پر خەمن
كەلەكين خەمان ريزو و گەلەگن
كەلەكين ب ئوميدان باركرى
ب پرچا بچويكان كەزيين برى
ب گوهاركان كولاڤان گول ئاڤان
كلدانان دەرسوكان ب سلاڤان
ب ستيرا رژياى لێ نەڤەمرى
ب هەيڤەكا زەر نيڤ سەرژێ كرى
كەلەكين مە گەلو باركرينە
ب سەڤى يان حەتا ليڤا گرينە
ئەو ل هيڤى يا كەلەك ڤانى نە
ريبارين خورت ژێ هەل رابينە
تاڤا خورتان سەر ئەڤراز چوى نە
نەوروزامن دێ مزكينى يا بينە
نەوروزامن چل وشەش سال بورين
هەر ب زيمارم ئەز هەر ب لورين

پیرۆزبایی دەفتەری کوردەواری

# کوردە پیرۆز بێ جەژنی نەورۆزت
# نەبەزی لە ڕێی سەربەرزی هۆزت

●جەمال خەزنەدار●

بیرەوەرییەکانی نەورۆزی سالْی ١٩٧٠ ،تام و بۆنێکی تایبەتییان ،لەدڵ و دەروونی ڕۆشنبیرو نووسەری ئەم سەردەمەی کوردەواری‌دا هەیە . .ئەمە حەقیقەتێکە هەموومان هەر یەك و بە جۆرێك هەستی پێ دەکەین و لە بیرەوەرییەکانی خۆماندا تۆمارمان کردووە . .تۆ بڵێی لەبەر ئەوەبێ چونکە لەو ساڵەدا ، دان بەمافی ڕۆشنبیری کوردا نرا . . یا لە بەر ئەوەیە لە ١١ی نەورۆزی هەمان ساڵدا ، بەیانی ئاشتی بڵاوکرایەوە . . یا لەبەر ئەوە بووبێ بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ژیانی ڕۆشنبیری کوردا ، کۆڕی زانیاری کورد دامەزرا . . وەیا خود لەبەر ئەمانە هەموویان . . هەرَ بە یادی نەورۆزو ساڵی تازەوە ، لە ساڵی ١٩٧٠دا ، لە گۆڤاری دەفتەری کوردەواری . . یادی نەورۆز وا دەکەمەوە :-




## دەست لە ناو دەست..لەگەڵ نەورۆزدا

لەم ڕۆژەدا، کە بای وەعدە . .هەرەسی بە قەڵای سەختی ساردو سڕی زستان دێنێ . . هێزی ژیان دەروونی شەختەو باڵی ئەستووری کۆیلەیی بەفر هەڵدەدڕێ، گوڵ و گوڵاڵەو ڕێواس و ئاڵەکۆك ئازاد دەبن و سەر بەرز دەکەنەوە . . وە بە ڕووی ڕۆژگار پێدەکەنن، بە بەرگی ڕەنگاو ڕەنگیان مژدەی ساڵی تازە دەدەن بە کوردستانی نەخشین . .بانگیان دەکەن کە لە مێرگە ڕەنگینەکان ،لە تەختایی شاخەکان، لەدۆڵ و شیوەکان لە دەشتە بەرین و پڕ پیت و پرشتەکان . . لە تەك ئەوانەوە دەست بگرین و شایی‌و زەماوەند

هەر لەم ڕۆژەش دا سەردەمێکی ڕابردوو کاوەی قارەمان هەرەسی بە هێزی چەوساندنەوەو زۆرداری ئەژدهاك هێنا مژدەی ئازادی‌دا بە گەلە نەبەزەکەمان . .

لەم ڕۆژەدا، کە مێژوو . لاپەڕەیێکی ڕەشی ساردی لوولدا ، لاپەڕەیێکی سپی‌و ڕوونی کردەوە، سروشتیش بە گوڵ و هەڵاڵە ئەو لاپەڕەیەی ڕازاندووە، تاجی نەورۆزو بەهاری لە سەرنا.

لەم ڕۆژەدا، نەورۆزی پیرۆزو جوان:

نیرگس لە مێرخوزارائەزانی
بەچی ئەچێ
بنوارە ئاسمان لە شەوا . .
عەینی . .ئەوە بلبل ئەخوێنێ ،
با لە بەرگی گوڵ ئەدا
خونچە، لەجیاتی گوێ بگرێ
دەم ئەکاتەوە

بە دڵێکی پر لە خۆشی‌و کامەرانی ،پیرۆزبایی، لە گەلی کوردو هەموو ئادەمیزاد دەکەین و دەڵێین :
پێکەوەنەوە . .
با هەموو ڕۆژێکمان نەورۆز بێت.
با هەموو ژیانمان پڕ لە گوڵ و گوڵزار بێت و لە ئاوازی مەل و بلبل . .
با هەمووومان دەست لە ناو دەست بین . .
لە گەڵ نەورۆزو . .تا هەزاران نەورۆزی تریش . .

● یەکێ لەو بابەتانەی بەم تازەییە لەسەر داستانی نەورۆزنووسراو لەم ماوەیەدا لە شێوەی کتێبێکی قەوارە گەورەی (٧٣)لاپەرەییداو لە سەر ئەرکی دەزگای رۆشنبیریی‌و بڵاوکردنەوەی کوردی کەوتە بەر دەستی خوێنەران ـ بەرهەمێکی نایابی مامۆستا حیلمی عەلی شەریف بوو بە ناونیشانی (داستانی نەورۆزو نەورۆزی کوردستان)کە ئەمانەوێ لێرەدا لەیادی نەورۆزدا بەکورتی بە خوێنەرانی ئازیزی رەنگینی بناسێنین

● مامۆستا حیلمی ئەم هەوڵەی پێشکەش کردووە بەو دایك و باوکانەی کە دەستی رۆڵەکانیان لە کوری نیشتمانی‌و نەتەوە پەروەری ومروڤ دۆستی‌دا گرتووەو ئەو رۆڵانەش کە بەخامەی پیرۆز مێژووی خەباتی دلێرانەی گەلەکەیانیان رازاندۆتەوەو وشەی پەروەردە کردن و سەختی خەباتی رەوای سیاسی‌و ئابوری وکۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری گەلەکانیان هەمیشە بەرەو پێش بردووە.

دووای ئەوە مامۆستا لە پێشەکی‌دا رونی ئەکاتەوە، کە ئەم بەرهەمە چۆن چەکەرەی کردوو چۆن هاتە بەرهەم و ئەبێ نووسەر چۆن سەیری نەووزۆ بکات و چۆنی هەڵسەنگێنێ ، تا ئەگاتە ئەوەی کە ئەڵێ :ـ

+ ئەوەندەی من لێی شارەزا بم هیچ نەبێت بە زمانی کوردی لەم چوار چێوەیەدا بەم شێوەیە باسی نەورۆزو سەرچاوەی پەیدابوونی‌و پێوەندی بە نەتەوەی کوردەوە نەکراوە کە

# داستانی نەورۆزو نەورۆزی کوردستان

کاروان

● نەورۆزی کورد هەرچی لەسە بنووسرێ هەقی خۆیەتی‌و شایانی گشت هەوڵ و تەقەلایەکی دڵسۆزانەیەو گەلێ لایەنی تاکو ئەمرۆش لای زۆربەی رۆشنبیران و بەشی زۆری نەتەوەکەشمان روون و ئاشکرا نەبودەتەوەو لە ئەسڵ و فەسڵی سەرگوزەرو رووداوی نەورۆزدا گەلێ راو بۆچوون هەیەو گەلێ گفتوگۆو مشت مڕیشی لەسەر کراوە، بەڵام هێشتا هەر هەقی تەواوەتی خۆی نەدراوەتێ.ـ



هیوادارم تروسکایەکی بچوکیش بێت بیخاتە سەر مێژووی نەتەوە قارەمانە نەبەزە بەش خوراوەکەمان : ئینجا مامۆستا حیلمی بە ناونیشانی کتێبەکەی ئەچێتە ناو باسەکەیەوە، کە بە گشتی کردوویەتی بەم ناونیشانانە :

ـ نەورۆزو داستانەکەی لە نێو گەلانی ئاریاییدا . . .

ـ خەیاڵ و ئەفسانە پۆشیی رووداوە مێژووییەکانی گەلان و جیهان . .

ـ نەورۆزی کوردو کوردستان . .

ـ ضحاك و ئاستیاك لە مێژوودا . .

ـ نەورۆز لەنێو مێژوو نووس و ئەدیبانی کوردا

لەم بەشەدا نووسەر گەلێ بەرهەمی ئەدیبان و نووسەرانی کوردی بۆ نەورۆز ، بە شایەتی باسەکەی خۆی دانـاوەو لە کۆتاییشدا ئەگاتە ئەم ئەنجامە :ـ

+ وەڵە ئەنجامی باسەکەدا ئەو راستی‌یە ئەخەمە روو کە نەورۆز خەریك بوونێکی گەلێك لەمە زیاتری ئەوێت ، ئەم ئەرکە گرنگەش ئەکەوێتە ئەستۆی مێژوو نووسانی زاناو شارەزایانی داستان و ئەفسانەو رەخنەگرانی مێژوو ئەدەب و چیرۆکی کوردی کە ئەگەر هەر کەسێك لەم بەیزانە دێرێکی نوێ بهێننە کوری ئەم بابەتەوە ، ئەوا لەکێتبخانەی کوردی‌دا زانستی‌یەکی نوێ ئەخەنە پاڵ ئەوانەی پێشو ئەرکێکی سەرشانیش بەرامبەر نەتەوە تێکۆشەرە وەفادارەکەیان جێبەجێ ئەکەن.

● ئەوەی شایانی باسە مامۆستا حیلمی کەڵکی لە ٥٠ـ٦٠ سەرچاوەی گرنگ وەرگرتووە و ئێمەش هیوادارین شارەزاکانی‌دنیای مێژووی نەتەوە کەمان زیاتر لەم داستانە بکۆڵنەوە وزیاتر هەوڵی رونکردنەوەی هەموو لایەنەکانی بدەن و لەگەڵ پیرۆزبایی‌و دەست خۆشی‌دا داوای تەمەن درێژیش بۆ مامۆستا حیلمی ئەکەین و نەورۆزی هەموو ساڵێکمان پیرۆز.





پەیکەری تین هاو

# باخچەی تایگەر باڵم لەهۆنکۆنگ

TIGER BALm GARDEN

هەر وڵاتە بە جۆرێك ناوبانگی دەرکردووە. هەر یەکە هەر هیچ نەبێت یەك دوو نیشانەی بەناوبانگی هەیە کەپێی دەناسرێت و شانازی پێوە دەکەن.

ئەوەی بە مێژوو و کەلوپەل و دەستکردەی دێرینە یان هونەرمەندانەو فولکلۆری و ئەوەی, بە دیمەنی سروشتی جوان ، ئەوانەی هەر هیچیشیان نەبووبێت خۆیان بیریان کردۆتەوە و هەر لە ئەنجام دا نیشانەیەکی وایان کردووە کە هاوتای نەبێت لە وڵاتانی تر ئەمە گەلێك جار کردەی هونەرمەندێك بووە وەك باخچەی پەیکەرتاشی سویدی لە ستکهوڵم (میلەرس گۆردن)و باخچەی ڤیگەلوند لە نەرویج ، بورجی ئیڤل لە باریس جا مۆزەخانەی کارلیسبێرگ لە دانیمارك هەر وەها پەیکەری (حوری)یە بچووکەکەی کوپنهاگن و ئەمانە کردەی کارل جاکسۆن خاوەنی گارگەی بیرە لەوێ و هەزاران وێنەی تر لەم جۆرانە باخچەی تایگەر باڵمی هۆنکوك ئەمەش بۆتە یەکەم نیشانە بۆ دورگەی هۆنك کۆنگ.

هۆنکۆنگ دورگەیەکەو بەشێکە لە دورگەیەکی هەرە گەورەتر کە کراوە بە چوار پارچەوە کەوتۆتە سەر کەناری دەریای هێمن . ئەمە کاتی جەنگی گەورە لەچین جیاکراوەتەوە و ئێستا وەك بازارێکی گەورەی بازرگانی رۆژ ئاوای لێ هاتووە. کاتێکی بە فرۆکە بەسەر دورگەکەدا دەروێت و سەری خوارەوە دەکەیت سەرسام دەبیت لەوێەی بە تایبەتی





بەشـەو هەروا دەزانیت ئەم شارە گشت بیناکانی لە کریستالی رەنگاو رەنگ دروستکراون. چونکە هەر لایـەك دەروانیـت وادەزانیـت چراخـانـە. دارو دیوار نابینیت لە دورەوە تۆریکی ئاسنین و بەهەموو لایەکیدا روناکی رِنگاو رنگ بڵاو دەبێتـەوە لەنـاو تاریکی رەشی شەودا. شاری هۆنـگ کۆنـك بریتی‌یـە لە دووکـان و بازاری مجـەوهـەراتی نایـاب سەیـرو سەعـات و ئامـێری کەهـرەبـائي جۆراوجـۆر. ئەمە شاری بازرگانە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهانەو لێرەدا ئەگـەر وریـاو زیرەك و زانا نەبیت دەست بڕ زۆرە. لێرە دا بازاری پارە گۆرینەوەش زۆر هەیە.

باخچەکەی تایگەر باڵم

TIGER BALm GARDEN

ئەوەی ئەم جێگـە سەیرو سەمەرەیە ببینێت یەکسـەر دەڵێت کەی ئەمە باخـچـەیـە؟ و بۆچ ناوی نراوە باخچە؟ لێرەدا وشـەی باخچـە لە وشـەی Garden وەرگـیراوە ئەگینـا بەراستی ئەم وشەیە زۆر زۆر کەمە ونرخی ئەم دیمەنە بێ هاوتایە زۆر کەم دەکـاتەوە. بە وێنەکاندا دەبینن بۆ خۆتـان کە ئەمە زۆر لە باخچە زیـاتـرە ئەمـە شارێکـە بۆ خۆی . .شارێکی ئەفسـانەیی!!شارێکە مەگەر هەر بەخەوو خەیاڵ بێتە دیی!

ئەمە کردەی دوو برایە یان چەند برا بە ناوی (A w)broThers ناو براون و Aw broTher of BALM TICER (ئۆی باڵم تاریگەر)جا ئایا باڵم تایگەر ناوی راستەقینەیان بووە یان ناو نیشان بووە نازانرێت واتای باڵم تاریگەر بەپێی فەرهەنگ =پڵنگی بە بۆن یان پڵنگی سارێژکەر بەڵام باڵم بە تەنها بەو بۆن و بەرامەیە دەڵێن کە لە داری هێـنـــدێـك درەخـت دەردێت. و ئەمە بۆن و بەرامەیەکی هەرە خۆشی هەیە ونرخی ئێجگار گرانە.

ئەم کابرایانە یان برایانە زۆر هەژارو دامـاو دەبن لەپـر بەئیش و کارو هەوڵـدان دەبـنـە خاوەن پارە و گەنجێکی ئێجگـار بە لێشـاو. بۆ سوپـاسی یەزدان کە ئەم گەنجەیان بەسـەردا دەرێـژێت ئەم باخچـە سەرنج کێشە نایابە فراوانە جۆراو جۆرە دڵگـیرە دروست دەکەن. کە پێنووس ناتوانێت وشە بدۆزێتەوە بۆ باسـیـان بە جۆری لەهـاتوو و گونجـاویـان بە کورتی ئەمە لە قەد چەند گردێك کراوە بەرامبەر Cause-way کە خەلـیـجێـکـە لەوێ ساڵی ۱۹۳٥ دەستی پێکراوە و(۱٦)شازدە هەزار دۆلاری هونـگە کۆنـگـی تێچـووە. زەوی یەکـەی هەشت (۸) ئەیکەری گرتۆتەوە. جگە لەو هەموو شتە سەیرەی تیاکراوە چەند بنیایەکی چینی تێدایـەو گەلێك پەیکـەری ئەفسـانـەیی چینی و لە گشـت گرنـگـتر ئەو پەگـۆدا (زیگـۆراتـە)حەوت نهۆمی‌یەیە کە ١٤٥ پێ بەرزەو بۆتـە نیشـانـەی هونك کۆنگ جگە لەمانە بە بەرزایی ئەو گردانـەسـەدەهـا پەیکـەری گیـانـەوەر وەك هی تیمسـاح کە وادەزانیت راکشاوە بۆسەرەوە لەناو ئاوی حەوزەکـانـداو لە ژێـر فوارەکـان دا هەروەهـا هی مەرِو ماڵات هەر وادەزانیـت ئەمـانـە گیـانـەوەری راستی زینـدوون بەرەنـگ و بە شیـوە لە سەرەوە پەیـکـەرێـکـی هەرە گەورەی (بـودا)هـەیە لەم بەرو ئەو بەری گردەکـان بە قاڵـدرمـەی پان پان و درێژ سەر دەکەویتە سەرێ پلە بەپلە پەیکـەری ئافـرەت و پیـاو منـداڵ بەجلو بەرگی کلاسیکی رۆژ ئاواوە لە ژێر بنمیچی خانوی چینی بەسەر هەیـوانی درێـژی پێچاوپێچـدا. بەهـەزاران گەشت کەر بەسەر ئەو پلەو شۆسـانـەدا دەرۆن و لەو هەیـوان و (بـالقـۆنـانـەوە)سەیری ئەوەش دیمـەنـە سەر سورێنـەرە دەکـەن. کەس نی‌یـە گوێ بداتـە باران کە زوو زوو دادەکـات ئەو پەرەکەی ئاور بلەرەوە چەتر فرۆش چەتـری رەنگـاو رەنگی هەرزانیان پێ‌یەئەوەش دیمەنێکو، ترە هێنانەوەی دەبێتـە یادگـاری ئەو دیمـەنـە کە بەخـەویش بروانـاکـەیت ببینیت ئەگەر خۆت نەچیتە سەیری.

بینین و وەرگێران

و ئامادەکردنی

ناهیدە رەفیق حیلمی

رەنگین ۹/

۱۹۹۲/٤۰

# له ئه‌رشیفی دوکتۆر مارف خه‌زنه‌داره‌وه

## «هێمن»

● ئاماده‌کردنی: ئیسماعیل به‌رزنجی ●

● ماموستا چۆن هێمنت ناسی؟

+ له مێژ نه‌بوو له هه‌نده‌ران گه‌ڕابوومه‌وه وڵات، ڕۆژی ٣٠ ی ته‌مووزی ١٩٦٨ که ڕۆژی ته‌واوکه‌ری ١٧ ی ته‌مووز بوو محه‌مه‌د مه‌ولوود (مه‌م) و من میوانی هه‌ژار بووین له حاجی ئۆمه‌ران.

ئێواره که گوێیان له قسه خۆشه‌کانی هه‌ژار ده‌گرت، کابرایێکی به دیمه‌ن ڕووته‌ڵه له دارفرۆشی ده‌کرد، له کۆڕه‌که نزیك بووه‌وه، سڵاومان دایه‌وه هه‌ژار وتی: ئه‌مه مام حه‌سه‌نه، شیعری هه‌نه.. مام حه‌سه‌ن هێمنی شاعیر بوو، له پاشانا له‌گه‌ڵمانا هات بۆ دیده‌نی هه‌ولێرو سلێمانی‌و بوو به میوانی مه‌م و من له ماڵی خزمه‌کانی هه‌ولێرو سلێمانیم.

● له پاشانا؟

+ له پاش به‌یانی ١١ ی ئازار بووم به هاوڕێ‌و هاده‌می هه‌میشه‌یی هێمن له به‌غدا، له جه‌ژنانا، له هه‌ینی‌یانا خۆی‌و هاوڕێکانی ده‌یانپرسیم.

● ئه‌ی کاروباری ڕۆشنبیری؟

+ ئێمه کارمان ته‌نیا لێکۆڵینه‌وه‌ی زانستی‌و شیعرو ئه‌ده‌بیات بوو.

● ئه‌رشیفی هێمن؟



+ نامه‌یێکی درێژو گرنگی هێمن پارێزراوه، بریتی‌یه له ٧ لاپه‌ره له ١٩٧٢/١١/٧ بۆی ناردووم.

● با ئه‌مه بڵاو بکه‌ینه‌وه.

+ زۆر درێژه، بۆ ئه‌م ماوه‌یه ده‌ست نادا، له دووا ڕۆژدا ده‌کرێ وه‌کو وتارێك بڵاو بکرێته‌وه.

● نامه‌که بۆچ گرنگه؟

+ گرنگه چونکه دوو مه‌سه‌له له مێژووی ڕۆشنبیری کوردی ڕوون ده‌کاته‌وه، یه‌که‌میان شیعری ئاسمانه شینه‌که‌ی پیره‌مێرد که له ماوه‌ی جه‌نگی دووه‌م دا له سپیاره‌یێکی شیعری سیاسی کۆمه‌ڵه‌ی ژێ کاف به ناوی شێخ ئه‌حمه‌دی حیسامی‌یه‌وه بڵاو کراوه‌ته‌وه؟ دووه‌میان مه‌سه‌له‌ی (مسته‌فا شه‌وقی)ی ڕۆشنبیرو پزیشك و شاعیرو خزمی قازی محه‌مه‌دو خه‌ڵکی مه‌هابادی موکریان.

● چی تری گرنگ له ئه‌رشیفه‌که‌دا هه‌یه؟

+ ده‌ستنووسی چیرۆکی شیعری (سووری ده‌وران) به ده‌سخه‌تی هێمن له ١٩٧٧/٢/١ کۆتایی پێ هێناوه‌و بریتی‌یه له (٧٠) لاپه‌ره.

● نموونه‌ی هه‌ره جووانی ئه‌رشیفه‌که؟

+ ڕۆژی نه‌ورۆزی ١٩٧٥ هێمن میوانیان بوو له ماڵی ئه‌وسای به‌غدامان، میدیای کچم له قوتابخانه‌ی ناوه‌ندی بوو. داوای نه‌ورۆزانه‌ی له مام هێمن کرد، مام هێمن شاعیر په‌ره کاغه‌زێکی هه‌ڵگرت و بۆی نووسی:

بۆ برازای خۆشه‌ویستم میدیای خه‌زنه‌دار
هه‌میشه ده‌رد ده‌بینم، ده‌رد ده‌بینم
که فیلی دوژمنی نامه‌رد ده‌بینم
مه‌گه‌ر سۆمایی چاووم ڕۆ ڕژاوه؟
که‌وا ڕه‌نگی به‌هاری زه‌رد ده‌بینم

هێمن


بۆ برازای خۆشه‌ویستم میدیای خه‌زنه‌دار
هه‌میشه ده‌رد ده‌بینم، ده‌رد ده‌بینم
که فیلی دژمنی نامه‌رد ده‌بینم
مه‌گه‌ر سۆمای چاوم ڕۆ ڕژاوه؟
که وا ڕه‌نگی به هاری زه‌رد ده‌بینم
نه‌وروزی ١٩٧٥ هێمن

# جەژنە پیرۆزە بۆ ڕۆژی شانۆی جیهانی



عومەری عەلی ئەمین

هەموو جارێك کە پەنجەی ساڵ پەرەکانی ڕۆژ ژمێرەکەی خۆی هەڵدەداتەوەو دەگاتە ڕۆژی ٢٧ی مانگی مارت، . . ئەو بەیانی‌یە کەخۆر لەئاسۆوە چاو هەڵدێنێت، . . بە یەکەم تیشکە زێرینەکانی دەست دەکاتە ملی شانۆکانی ئەم سەرزەمینە گەورەیەو، بەدەم بریق وباقی زەردەخەنەوە، پیرۆزبای‌یەکی گەرمی یادی ڕۆژی شانۆی جیهانی‌یان لێ‌دەکات و لە چریك و هووری ڕووناکی‌یەکەی خۆی، جەژنانەی خۆیان پێ‌دەبەخشێت. . ئیتر زەنگی ئاهەنگە لێ‌دەدرێ‌و فیستیڤاڵی ئەم جەژنە سەرانەری دنیای شانۆ دەگرێتەوەو. . دنیای ڕۆشنبیری‌و ئەدەبیش بۆ پیرۆزبایی دەکەونە خۆیان.

منیش لەم کاتەدا کە لەبەر ڕووناکی ئەم بەیانی‌یە گەشەدا لەناو زایەڵەی زەنگی ئەم ئاهەنگەدا لەبەر دەرگای شانۆ کوردی یەکەی خۆماندا ڕاوەستام:

بەباڵی کۆترە سپی‌یەکەی نامەبەردا، شیعرو نامەی پیرۆزبایی پێشکەش شانۆکانی جیهان دەکەم. . . بە شنەی شەماڵدا سڵاوی بۆن خۆش و عەترلی بۆ هونەرمەندانی دەنێرم و. . بە ئاوازی شمشاڵدا سروودی ڕێز پێشکەش نووسەرانی دەکەم. تۆش! خۆشەویستم شانۆی کوردی! تۆیەکیش کە بە ئاواتەوەیت لەم یادەدا داب ونەریتی جەژن بەجێ‌بهێنیت و خۆت برازێنیتەوە، لەگەڵ هونەرمەندانی خۆتدا دەست بگریت و لەسەر ئاوازی دەقی نووسەرانت بەدەم هەڵپەڕکێ‌و قریوەی خۆشنوودیت بەرەوناسمان هەڵچێت، . . لە یادەدا دەم بینیت . هاتوومەتە بەر دەرگاکەت و بەدڵێکی گەش هەستەوە دەڵێم:

ئەوەندەی دڵۆپی باران. . !<br>
ئەوەندەی گەڵای داران. . !<br>
ئەوەندەی زیخ وا چەمان. . !

جەژنت پیرۆزبێ‌و ڕێزو ستایش پێشکەش بە نووسەرانت بێ‌و، سڵاوی جوان لە هونەرمەندانت بێ! . . . ئاواتەخوازم ئازیزم ساڵانی داهاتووت، دەنگی دراماو دەقی خۆماڵیت هەر زوڵاڵ بێت و . . . داواکارم سەکۆت پڕ تفاق و هۆڵت پڕ کورسی‌بێتو، چاوڕوونی بینەرانی خۆت بێت.

خۆشەویستم شانۆی‌کوردی! بەبۆنەی ئەم یادە شیرینەوە: لە تیشکەکانی مانگە و ڕۆژ تاجێك دەچنم و پێشکەش سەری تۆی دەکەم. ! بە قاسپەی کەوی خاڵ وملی جواندا؛ گۆرانی ڕێزو ستایش بۆ درامانووسانت دەڵێم. . ! لە پیاڵەی گوڵەهێرۆی ناو دەغڵە سەوزەکاندا شەربەتی خۆشەویستی‌و نەوازش بۆ هونەرمەندانت دەگێرم. . ! لەناو ئاهەنگی ڕەنگەکانی پەلکەزێرینەدا بەمنەتباری‌یەوە سوپاسی جەماوەری بینەرانت دەکەم. . . ! ئاواتەخوازم هەمیشە وەك بولبولی سەرچڵان زایەڵەی دەنگە و ئاوازت؛ لەناو گوڵەجارەکاندا هەر بزرنگێتەوە. . . !

# هونەری ئۆپـرا

هونەری ئۆپرا بەشێکە لەو جیهانە ئەفسوناویەی هونەر کە مرۆڤ هەر لە سەرەتای مل ملا نێی دا لەتەك کێشەکانی ژیان دا پێی ئاشنابوەو هۆکارێکی خۆ دۆزینەوەی خودی مرۆڤ بووە.
ئەم هونەرە خاوەن دەنگ و زایەلەیێکی گەورەیە لە ئاسۆی بەرینی هونەری موسیقادا وداهێنانێکی ترو گۆرینێکی مێژوویی موسیقای رۆژئاوایە.

*ئۆپـرا، داستانێکی هونراوەیی شانۆیی گۆرانیئامێزە، بابەتەکەی زۆر جار ساتەکانی خۆشەویستیو ئاوازەکانیشی لەرووی دانان و دارشتنەوە بە بەرزترین جۆری دانان دائەنرێت بە جۆرێك کە دانەر چاودێری سیاو ئاکاری ئەو سەردەمە دەکات کە داستانەکەی تێدا نووسراوە*

گۆرانی لە ئۆپـرادا لەلایەن چەند گۆیندەیەکی چینە دەنگی (تینۆر)و (سپرانو)ئەوترێت کە ئەمەش واتای تێ هەلکێشکردنی دەنگی پیاوان کە تینۆرە لەگەل دەنگی ئافرەتان کە سپـرانۆیە. لەگەل ئەمەش دا ئۆپرا پێویستی بەچەندین ئامێری جۆر بەجۆر هەیە کە بتوانێت بە شێوازێکی جوانکاری بابەتەکانی ئۆپراکە دەربەرێت.

**✻مێژووی ئۆپرا:**

وەك لەسەرەتادا ئامارەمان بۆ کرد کە ئەم هونەرە خۆی لەخۆی‌دا شانۆیی‌یەکە گۆرانی‌و موسیقاو دووبارە سەمای تایبەتی لەئامێز دەگرێت.

لەگەل ئەوەش دا کە مێژووی دەگەرێتەوە بۆ سەرەتاکانی شانۆیی‌یە گۆرانی‌یە ئامێرەکان وەك (ئەسخیلوس و سوفوکلیس و یوریبیدس). بەلام ئەوەی کەئێمە لەئەمرومان دا پێی ئاشناین، سەرچاوەکەی ولاتی ئیتالیایەو جی‌نزرگەی یەکەمینی ئۆپـرای ئیتالی لەلایەن کومەلێکەوە بەناوی(کامێراتا)لەدەوروبەری سالانی ١٥٨٠ی زاینی‌دا لەیەکی لە کوشکەکانی دەولەمەندانی شاری فلورەنسە دامەزرا کە ئەمەش چەند دانەرێکی موسیقای وەك (گالیلی‌و جولیوو ئەمیلیو)گرتە خۆی

بەم جۆرە بابەتەکانی ئۆپـرا لەچەندین ئەفسانەو چیرۆکی ناودارەوە وەردەگیران و بیرو بۆچوونی هەزاران مرۆڤی دەخستە روو.

یەکەم ئۆپـرا ئۆپـرای (دافنی)یە کەلەلایەن (بیری) دانەرەوە لەسالی ١٥٩٧ی زاینی‌دا دارێژراوە.

بەلام لێرەدا پێویستە ئامارە بۆ ئەوە بکەین کەرابەری ئۆپرا موسیقارەنی ئیتالی( مونت ڤێردی)یە کە یەکەم ئۆپـرای لەسالی ١٦٢٠دا لەشاری رۆمای ئیتالیا پێش کەش کردووە، بەدوای‌داو پاش دوازدە سال واتە لە سالی ١٦٣٢دا لە کۆشکی(بربرینی) یەکەم دەزگای ئۆپرا دامەزراو ئۆپرا بەناوبانگەکەی ستیفانو لاندی



کەناوی ئۆپرای (سانت ئەلیسو)ی تێدا پێشکەش کرا.

بەلام پێویستە ئەوە لەیاد نەکەین کە یەکەم دەزگای ئۆپرا لەجیهان دا لەشاری (ڤینیسیا)و لەساڵی ١٦٣٧ی زایینی‌دا دامەزراو بە دووی‌دا بۆ وڵاتانی دیکەی ئەوروپا گوێزرایەوە، تا وای لێ‌هات کە وەك بزوتنەوەیەکی هونەری نوێ لە فەرەنساو ئینگەلتەرادا لەسەدەی حەڤدەو هەژدەداو لە ئەلەمانیاو روسیادا لەسەدەی نۆزدەدا دەرکەوت.

## ❋ ئاواز لە ئۆپرادا:

سەرەتای ئۆپرا بە پێشەکی‌یەکی موسیقای ئامێران دەست پێ‌دەکات کە ئەمەش واتای سەرەتای رۆمانی ئۆپراکە دەگەیەنێت.

ئۆپرا بەگشتی پێویستی بە ئاواز-دانانێکی تایبەتی‌یە لەرووی گۆرانی‌و موسیقای ئۆپراکە.

وەهەموو برگەکانی ئۆپراکە وێنەی حاڵەتەکانی تێدا بنوێنرێت و دووبارە برگە جیا جیاکانی واتای ناوەروکی خۆی بگەیەنێت هەروەها گۆرانی ئۆپرا پێویستە وەرگێرانێکی چەند برگەیەکی بچووکی ئۆپراکە بێت و بە موسیقایەکی ئاسك دابپۆشرێت کە ئەمەش خۆی لە خۆی‌دا رەونەقێکی جوان دەداتە وەسان و دەنگی گۆرانی بێژەکان و واتاو ناوەروکەکەی بەپێزتر دەکات.

دیسان ئۆپرا پێویستی بە زۆر ئامێری موسیقای جیا جیا هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت کە خواستی تەواوی ئاواز دانەرەکە بۆ ئەنجام دانی کارە هونەری‌یەکەو پتەوکردنی بابەتی ئۆپراکە دەربەرێت.

ئاوازدانەری ئۆپرا پێویستە زانیاری‌یەکی تەواوی دەربارەی هونەری موسیقا بەگشتی‌و زانستی تیۆرەکان و دەنگ و ئامێرەکان هەبێت.

دیسان ئاگاداری بنەمای دەنگەکان و کێشە موسیقی‌یەکان و زانستی پەیژەکانی موسیقا بێت چونکە ئەمەی دوایی گرنگی‌یەکی تەواوی هەیە لەکاری ئاوازدانان داو رۆل و بەتوانایی دانەری ئۆپرا دەردەخات، چونکە لەرێی پەیژە موسیقی‌یەکەوە دانەر دەتوانێت دەنگی گۆرانی بێژەکان یەك بخات و چینەکانی دەنگی پیاوان و ئافرەتان و منداڵان بە دیار بخات.

دووبارە پێویستە ئاوازدانەر بە ئاگای بنەرەتەکانی دەستووری موسیقاو لە دریژە پیدانی برگە موسیقایی‌یەکان و دووبارە بوونەوەیان دا دووورکەوێتەوە.

چونکە ئەم دوو حاڵەتەی دوایی وا لە لەگوێگر دەکات کەچێژێکی پاك و ئاسایی وەرگرێت و هەست بە بێزاری‌و نارەحەتی نەکات.

هەر بۆیە دەڵێن ئاوازدانەری ئۆپرا دەبێت خاوەنی بەهرەیەکی بێ‌گەردو رۆشنبیرێکی تەواوی بواری ئەدەبی‌و موسیقا بێت، ئەمەش لەپێناوی مامەڵەکردنی بلیمەتانە لەتەك کەرەستە خاوەکانی ئەم دوو بوارەوشیتەل کردنی پەیوەندی‌یە بەتینەکەیان و ئاشناکردنی ئەم هونەرە دڵرفێنە بە شەیدایانی هونەر بەگشتی.

ئامادەکردنی . زیاد بەرزنجی





# داخستنی گۆڤاری گەلاوێژو بیرەوەرێکی نێوان علاءالدین سجادیو پیرەمێرد

دلێر علاءالدین سجادي

پیرەمێردی شاعیرو ئەدیب و ڕۆژنامەنووسی ناوداری کورد پێوەندیکی ڕۆحیی پتەوی لەگەڵ گۆڤاری گەلاوێژ بووە کە باوکی ڕەحمەتیم ، هەرچەندە کە خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری لێپرسراوی نەبووە بەڵام، لە هێنانە بەرهەم و بە خوێندەواران گەیاندنیا هەمەکارە بووە.

پیرەمێرد، لە زۆرتری سەری ساڵەکانی گەلاوێژا، شتێکی تیا بڵاو کردووەتەوەو، لە ژینیشا هەمیشە بەشان و باڵیدا هەڵداوە. باوکیشم خۆی بەمریدێکی دڵسۆزی پیرەمێرد زانیوە. هەمیشە نامە لەنێوانیانا هاتووەو چووە هەرچەند هاوینان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، لە قەڵەندەرخانەکەی پیرەمێرد میوان بووە.



بە بۆنەی داخستنی گۆڤاری گەلاوێژەوە لە ئابی ١٩٤٩دا بە بیانووی بەندکردنی خاوەن ئیمتیازیەوە، پیرەمێرد نامەیەکی بۆ باوکم نووسیوە، لە گۆشە نیگایەکی قانوونیی ڕووتەوە، لەژێر سایەی ڕژێمێکدا کە قیمەتێکی ئەوتۆی بۆ قانوونەکانی تەنانەت خۆیشی دانەناوە، لەوە دواوە تیایا کە ئەتوانرێ کارێ بکرێ یەکێکیتر ئیمتیازی گۆڤارەکە وەربگرێو دەریکاتەوە، بەڵام لەو ئاگرە سوورەی عورفو گرتن و ڕاونانی نیشتمان پەروەران و دەم دروونەی ئەو سەردەمەی هەموو دەنگێکی ئازادا هەرگیز لەوانە نەبوە ڕێگای گۆڤارێکی ئازادیخوازی کوردی بدرێ دەرچێ، هەر بۆیەیش گەلاوێژ بەبۆنەی بەندکردنی خاوەن ئیمتیازەکەیەوە داخراوە، ئەگینا قانوون ڕێیئەدا خاوەن ئیمتیاز کە لە بەندیخانە بووە ئیمتیازی گۆڤارەکەی ببە خشێ یا بفرۆشێ بە کەسێکیترو گۆڤارەکە دەرچێتەوە.

بە هەرحاڵ ئەمە دەقی نامەکەی پیرەمێردو ، لەپاش ئەویش ئەو پارچە شیعرەی بڵاو ئەکەینەوە کە بەبۆنەی داخستنی گەلاوێژەوە دایناوەو لە نامەکەیا ئیشارەتی بۆکردووە:

«کاکە عەلا

«بەراستی لە کەوتنی گەلاوێژ چاوم تاریك بوو.

بەرگی هەتیوی ئەدەبیان درا[١]. لە سەرمای تۆق چەرخ سەرمان سرما.

«دیسان ئێمە نابێ نائومێد بین. هەر ئەو ئیمتیازە کە سێکیتر ئەتوانێ وەریگرێ. یاری، خۆت بیسێنە.

ئەگــەر پێــویست بێ خەبەرم لێ بگــێڕەوە منــیش بێــم. زۆریش ئارەزووم هەیە بتبینم. ئەنجا یا تۆ، وەرە. یا، «اولیارا کبر نباشد»[2].

منیش ناساغم. زۆر بێتاقەتم. ئیتر زوو خەبەرم بدەرێ.

یا زوو وەرە.

شینی گەلاوێژ لە ژیندایە.

پیر مێرد

بەداخەوە لەناو ئەوراقی باوکمدا رەشنووسی وەڵامەکەیم بۆ پیرەمێرد نەدۆزییەوەو نەمزانی ئاخۆ وەڵامی بۆ نووســیوەتــەوە، یا چووە بۆ سلێــمانی بۆلایو ، هەڵـوێستی لە ئاستی داواکەی پیرەمێرد چۆن بووە.

ئەمەیش شینەکەی گەلاوێژ، وەك لە کتێبی (پـیرەمێردی نەمر)ی مامۆستا محــەمــەد رەســووڵ هاواردا لەچاپ دراوە[3]


کاکه عمر

پیره میرد

داد لە دەست جەورت هەی چەرخی سەرچەوت
وا گەلاوێژ کەوت، گەلاوێژ بـۆچ کــەوت[4]
ئـاسـۆی ئـەدەبــی کــوردی پــڕ تـەمــــە
سـفـیـدەی بـەیـان شینـە، مــاتــەمـــە
(ژیـن) بۆ (گەلاوێژ) بوو بـوو بــە پـــەرژیـن
ئیستــا لـــەدوای ئـەو بێــزارە لــــە ژیــــن
(ئیبـراهیـم) لـەناو (نـــار)اســـووتـــاوە
(سەججادە)ی تـەقـوا بــێرایــەڵ مـــاوە[5]
هـیـوامان وایـە کـە چـــەرخ وەرگـــــەڕێ
سەجـادەم بـەسـەر شــــەتــدا بـگــەڕێ[6]
پیـاوێکمان بمـرێ تـەعــزیــی بــۆ دەگریـن
بۆچ بۆ گـەلاوێژ نەگرین تـا دەمــریـــن[7]
گەلاویــژ هەرچـــەنـد جارجـــارە هــەڵـدێ
لە بورجی خۆیدا دوایـــی هـــەر هــەڵـدێ[8]

## پەراوێز

(١) گۆڤاری گەلاوێژ لە وەرزی کەوتنی ئەستێرەی گەلاوێژا، کە لە ئاخری هاوین و سەرەتــای گەرمــا شکــانــا ئەکـەوێ، داخــراوە. کەواتـە (کەوتنی گەلاوێژ)دوو مەعنای هەیە. کوردیش، کە سەرمــا هات، ئەڵێن بەرگی هەتیو درا، چونکە هەتیوی هەژار لە هاوینا ئەوەندە پێویستی بە جلوبەرگی باش نییە.

(٢) رستـەیـەکی حیکمەتی فارسییە، واتە! پیاوانی خوا قیزیان نییە مەبەستی ئەوەیـە: تۆیێفیـزو دەعیەی، ئەتوانی بێی بۆ لامان بۆ سلێمانی.

(٣)محەممەد رەسووڵ هاوار، پیرەمێردی نەمر، لاپەڕە ٣٣٥، بەغداد، ١٩٧٠، چاپخانەی (العاني).

(٤) مەبـەست لە (گـەلاوێـژ)ی یەکەم ئەستێرەی گەلاوێـژو، لە گەلاوێـژی دووەم گۆڤاری گەلاوێژە.

(٥)ئیشـارەتـە بۆ فرێـدانـە ناو ئاگری نەمروودی حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر کە لە سەردەمی یەکێ لە شاهانی بابلدا لە عێراق روویداوەو، مەبەست خـستـە بەنـدیخانەی خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری گەلاویـــژە لە بەغـــدا . سـەجـجـادە: بەرماڵ ئیشــارەتـە بۆ ناز ناوی باوکم (سـەجـجـادی)کە لە هەمان کاتا ئیمامی مزگەوت و خاوەن بەرماڵیش بووە.

(٦) واتـە: بەرماڵی بەختەوەریی کورد بەسـەر ئاوی شەتی دجلەدا بێو بچێو هەموو مرازێکی کورد بێتەدی.

(٧) لە وشـەکــانــی (دەگــریــن)و (نـەگـرین)دا یاری بە وشـە کردنێکی ناسك هەیە کە هەرچەند لە یەك ئەچن هەر یەك واتایەکی تایبەتی هەیە.

(٨) (هــەڵـدێ)ی یەکەم بە مەعنــای هەڵاتــن و ڕاکــردن و ئاوابــوون و ، (هەڵدێ)ی دووەم بە مەعنای هەڵهاتنی تولـــووعـە. مەبـەستیش لە (چـەرخی خۆی)چــەرخــی پەیــدابــوونــی دیموکراسیو ئازادیی بڵاو کردنەوەیە.

تێبینی

لەنـوووسینی ئەم باسـەدا کاکـە حەمەی مامـۆستا مەلا کەریم یارمەتی باشیدام ،خوا نموونەیان زیادکات.

# شیعر لە نێوان دوو هاوسەردا



[illegible]

هیرش محمد امین

ریبوار: شیعر گەیاندینی بە یەك
کەژاڵ: یەکەم جار بەهۆی ئەدەبەوە ناسیم کاتێ لە قەڵادزێ بووین لە شانوگەرییەك دا وتارێکی ئەدەبی خوێندەوە، پاشان بەهۆی شیعرو نووسینەکانیەوە، منیش نووسینم هەبوو زیاتر لەیەك نزیکبووینەوە.

● مارەییەکەتان چەندە:
کەژاڵ: من تەنها داوای ئەڵقەکەیم کرد بەڵام بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی خێزانەکەمان هەندێ شتیان پێ کرد.
ریبوار: گللەیی لە ماڵەوەیان ناکەم چونکە بەپێی داب و نەریت بوو.

● ئەی باشە نووسینی ریگەی ژیانی ژن و مێردایەتی ناگرێت.
ریبوار: نەخێر
کەژاڵ: نەخێر زیاتریش دەبێت

● کامتان زاڵە لە ماڵەوە:
کەژاڵ و ریبوار: کەسمان بەسەر کەسمان دا زاڵ نین.

ئەدەب دوورنەکەوتنایەتەوە.

بەرای ئێوە ژیانی ژن و مێردی نووسەر باشە:
کەژاڵ و ریبوار: بەڵێ باشەو باشتر لەیەك دەگەن.

● گفتوگۆ لەسەر بابەتێکی ئەدەبی یان نووسین دەکەن:
کەژاڵ: بەڵێو هەرچیش بنووسین پیشانی یەکتری دەدەین.
ریبوار: راستەو چەند جار شیعری منداڵانم بۆ راست کردوەتەوە
کەژاڵ: ئەی چەند جار شیعرم بۆ راست کردویتەوە.

● لەنووسینی منداڵان دا کێتان بەدڵە:
کەژاڵ: لەتیف هەڵمەت
ریبوار: لەتیف هەڵمەت و جزا علی امین.

● راتان لە بارەی تازەگەری لە شیعردا:
ریبوار: مادام ژیان نوێ بوونەوەی

## ریبوار و کەژاڵ: کەسمان بەسەر کەسمان دا زاڵ نین

● خەڵکی دەربارەی ژن و مێردایەتیتان دەڵێن چی:
ریبوار: پێچاوێنی بێت خەڵکی بەخیلیان پێدەبات
کەژاڵ: خەڵکی خۆشحاڵ بەم هاوسەریەتیەمان، بۆ نموونە جارێك لە کۆرێك دا لە رانیە کچێك پێی وتم خۆزگە هاوسەری کاك ریبوار بومایە بۆ ئەوەی لە

تیایە، شیعریش پێویستی بە تازەگەری هەیە.
کەژاڵ: راستە هەموو شت تازەگەری دەوێت، لەوانەیە هەموو تازەیەکیش راست نەبێت.

● پەشیمان نین لە ئەدەب:
ریبوار: نەخێر
کەژاڵ: شانازی پێوە دەکەم

● یەکەم بەرهەمت بڵاوبووەوە چی

# کەژاڵ: کە شووم کرد تەنها داوای ئەڵقەیەکم کرد

بوو کەژاڵ خان.

- وتارێ بوو دەربارەی منداڵ لە ساڵی ١٩٨٧ دا لە هاوکاری بڵاوبوویەوە کاتی خۆشی هەندێ شیعرم بەناوی شەونم محمد قادرەوە بە هۆی باروودۆخی خۆمەوە بڵاوکردەوە.

● کەژاڵ خان ئەوا بوویتە دایکی (نامرێ) و شتی منداڵان دەنوسیت منداڵ چی‌یە:

- نامرێ پێش لەدایکبوونی ڕقم لێ‌ی‌بوو بەڵام ئێستا دەڵێم ژیان بە منداڵەوە خۆشە، چونکە پێگەیاندنی منداڵێکی ڕێک وپێک مانای پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ‌ی چاکە.

● کەژاڵ خان دەست دەخەیتە کاری تایبەتی ڕێبوارەوە.

- نەخێر سەربەخۆیی تەواوم داوەتێ،

ڕێبوار: بەڵام حەز ناکات دوور بکەومەوە.

● کە کارێکی هونەری دەبینن گفتوگۆی لەسەر دەکەن:

کەژاڵ و ڕێبوار: بەڵێ.

● هیچ نووسینێکتان بەیەکەوە نووسیوە:

ڕێبوارو کەژاڵ: بەتەماین شیعری منداڵانی هەردوکمان لە دیوانێکدا چاپ بکەین بەڵام تائێستا شتێکمان بەیەکەوە نەنووسیوە.

● بەرای ئێوە تەنگوچەڵەمەی خێزان چی‌یە:

ڕێبوار: نەبوونی‌و لەیەك نەگەیشتن.

کەژاڵ: داواکردنی شتی زیاد لە پێویست لە لایەن کەسوکاری کچەوە.

● کەژاڵ خان خوێندنت بۆتەواو نەکرد بەلای‌کەمەوە وەك کاك ڕێبوار ئامادەیت تەواو بکردایە:

- من گەیشتمە پۆلی شەشەمی ئامادەیی بەڵام بەهۆی نەخۆشی‌و بارکردن و دواییش شووکردنەوە نەمتوانی تەواوی‌بکەم.

● خۆشەویستی پێش هاوسەرێتی باشە یان لە دوایی‌دا:

- ڕێبوار: خۆشەویستی پێش ژن هێنان بنەرەتە هەرچەندە ئازارو ئەشکەنجەی زۆرە.



- کەژاڵ: خۆشەویستی ڕێکوپێك پەیوەندی بە پێش یان پاش شووکردنەوە نی‌یە ئەمرەو هەر دەمێنێت.

● ناخۆشی ڕوودەدات لە نێوانتانا:

● ناخۆشی‌یەکی وا ڕووی‌نەداوە. لە نێوانمان دا لە دە دەقیقەت زیاتری خایاندبێت، هەر منیش ئاشتی دەکەمەوە.

● خۆشترین کاتتان:

ڕێبوار: ئەو کاتەی میوانم دێ.

کەژاڵ: ئەوەندە لەگەڵیا ژیاووم کاتێکی نی‌یە ناخۆش بێ.

● دەربارەی بووك و خەسوو دەڵێی چی کەژاڵ خان:

- ئەوەندەی لەگەڵیان ژیاوم هەستم نەکردو وە وەك خەڵکی باسی ماڵی خەسوو دەکەن.

ڕێبوار: هەڵی دایە[وتویی]: کەواتە ماڵی باوکم باشن

کەژاڵ: مەرج نی‌یە باشی‌یەکە هەر هی ئەوان بێت.

● تازە ترین شیعرتان.

ڕێبوار: شیعرێ بەناوی سرووەوە بۆ منداڵان کە تیایدا دەڵێم:

سرووە جوانی شۆخ و شەنگ
بووکی ڕازاوەی قەشەنگ
ڕوومەت گوڵی گۆنا ئاڵ
ئەی جوانکیلەی ڕوو بەخاڵ...
هتد

کەژاڵ: ئەم شیعرە بە ناونیشانی دیاری:

دەڵێن کاتێ
کە بتەوێ دێرێ وشە
بکەیتە دیاری بۆ ئەو کەسەی
خۆشت دەوێ چی گەوهەری وشە
هەیە
لە ناو دەریای مێشك و بیردا دێتە
دەرێ
ئەی بۆ کاتێ
من دەمەوێ
نەوەك دێرێ
تاکە وشەیە بنووسم
پڕ بە پێستی وەفاو پاکی‌و دڵسۆزیت بێ
پەراو لەدەستم ڕا دەکا
پێنووسەکەش وەکو گۆچان
دادە چەمێ.

● منداڵەکەتان بۆ ناو ناوە (نامرێ):

ڕێبوار: من ناوم نەناوە

کەژاڵ: بەناوی شاری قەڵادزێ‌وە چونکە لە مێژوودا قەڵادزێ ناوی (نامرێ) بووە.

● لەکۆتایی‌دا دەڵێن چی:

ڕێبوار: ڕێزو سوپاس بۆ ئێوەو ئەوانەی بە ڕاستی دێتە ناو خزمەتکردنی ئەدەبەوە

کەژاڵ: بە قەناعەتەوە دەڵێم خۆزگە ئافرەتانمان ئەوەندە خەریکی خۆیان دەبن خۆیان بەئەدەبەوە خەریك دەکرد، ڕێزم بۆ ساراخان هەیە کە یەکەم هاندەرو یارمەتیدەرم بووو مامۆستای قوتابخانەشم بوو.

# «یاساو یاسا گەریی»



بۆ بەجێ‌هێنانی یاسا بە ئاسانیو بە ڕێـك وپێكی دەبێ یاسـاكـان ڕوون و ئاشكرابن تاكو هەموو كەسێ لێ‌یان بگاو بروایان پێ بكات.

(ڕۆمانی‌یەكان) بەو كۆمەڵە تەختەدارەی بە مۆم داپۆشرابوون و بەنووكـەدار لەسـەریان دەنووسی دەوت (كـۆدیـكس). ئەو تەختـەدارانـەش بەیەكەوە دەنوسان بەجـۆرێـك دەتـوانـین بڵێین تۆمارگەیەكیان پێك دەهێنا. بەڵام لە چەرخـەكـانی چوارەم و پێنجـەم دا وشـەی (كـۆدیكس) بۆ (كـۆمـەڵـە یاساكان) بەكار هات.

كۆمـەڵە یاساكان لە دێرزەمانەوە بریتی‌بـون لە چەنـد یاسایەك وەكو كۆمـەڵـە یاسـاكانی (حامورابی) ی سەدەی نۆزدەهـەمی پێش زایین لە سەردەمـی دەوڵـەتی بابـلی‌دا، لە (ڕۆمـا) ش دا كۆمـەڵـە یاسـاكانی (گـریـگـۆری‌و هورمـوچینی‌و سیـۆدۆس) لە ئارادابـون و ئەم یاسایانە ساڵی (٥٢٩) كۆمەڵە یاسای (چیـستنیان) پێك هێنا.

پاش ماوەیـەكی دوورودرێـژ لە (فرنـسا) دا وشەی (كۆد) بۆ كۆمەڵە یاسـاكـان دانـدراو لە سەردەمی (لـویس) ی چوارەمـیش دا گرنگترین دەقی یاساكان لە كۆمەڵە یاسایەك دا دارێژرا.

ئەمـرۆ لە هەمـوو وڵاتـانی جیـهـان دا ژمـارەیـەكی زۆری یاسـاكـان لە ئارادایەو، هەر وڵاتە بەپێی بۆچـون و پێداویستـەكانی، خۆی دایـان دەرێـژێ، بەڵام یاسا سەرەكی‌یەكان بریتین لەم كۆمەڵە یاسایانە:

١ ـ كۆمـەڵـە یاسـا شارستـانیەكان مەدەنی‌یـەكان:ـ ئەم كۆمەڵە یاسایە پەیـوەنـدی كۆمەڵایەتی‌و پەیوەندی نێـوان كەسـانـی كۆمـەڵـگـە ڕێـك دەخەن و مەرج و سنوور بۆ ماف هەر یەكـەیـان دادەنـێن و چارەسـەری بەرژەوەنـدی كەسێتی نێوان خەڵـك دەكەن نەك لە نێوان خەڵـك و دەوڵەت دا، بۆ نموونە، موڵكداریتی خانو مەسەلەیەكە تەنیا پەیـوەنـدی بەخـاوەن خانـوەكـەوە هەیـە، ئەمـەش ئەوە دەگەیەنێ كە خاوەن خانو سەربەستە ئەگەر لەناو خانـوەكـەی‌دا بژی یان بەكـرێی بدات یان بیـفـرۆشـێ یان چۆڵی بكات، ئەمە هەموی مافی خۆیەتی بەبێ ئەوەی دەوڵـەت دەست بخاتە ڕێگـەیـەوە تەنیـا لەهـەنـدێ باری نائـاسـایی‌دا نەبێ وەكـو سەپاندنی بەرژەوەنـدی گشـتـی بەسـەر بەرژەوەنـدی كەسـی‌دا، لێرەدا دەوڵـەت دەتـوانێ دەست بەسـەر خانوەكەدا بگرێ.

٢ ـ كۆمـەڵـە یاسـاكـانـی خەتـابـاری:ـ. ئەركی ئەستـۆی دەوڵـەتـە هێـمـن و ئاسـایـشـی هاووڵاتیان دەستەبەر بكات، بۆ ئەم مەبـەستە كۆمەڵە یاسای خەتاباری دانـاوەو ئەوەی سەرپێچی‌یـان لێ بكات سزا دەدرێ‌و سزاكەش دوو جۆرە یان پارەی لێ وەردەگیرێ، یان بەند دەكرێ، لەوانەشە سزاكەی لە سێـدارەدانی تێـدابێ، ئەم یاسایانە پەیوەندی هاووڵاتی‌یان بە دەوڵەتەوە ڕێـك دەخـەن. نموونەی ئەوانەی ئەم كۆمەڵە یاسایە دەیانگرێتەوە دزو جەردەو پیـاوكوژو ئەو كەسانەن كە دەست درێژی دەكەنە سەر كەسانی‌تر.

٣ ـ كۆمەڵە یاساكانی بازرگانیتی:ـ ئەم كۆمـەڵـە یاسـایـە تایـەتی‌یە بە بازرگانەكان و كاروباری بازرگانیتی.

٤ ـ كۆمەڵە یاساكانی سەربازی.. ئەمـەش پەیـوەنـدی بە دادگـاكانی سەربازی‌یەوە هەیە وەكو ڕاكردن لە خزمـەتی سەربـازی‌و گوێ ڕایـەڵ نەبون بۆ فەرمانی فەرماندەكان، یان كەسانی هێزە چەكدارەكان دەستیان لەدزی‌و پیاوكوشتن هەبێ.

٥ ـ كۆمەڵە یاساكانی هات وچۆ. بریتی‌یـە لەو یاسایانەی كە هات و چۆی ئۆتـۆمبێلەكـان و ڕەفتـاری شفـێرەكـان لە كاتی ئۆتـۆمبێـل لێخوڕین دا ڕێك دەخەن.

ئەمـە جگە لە كۆمەڵە یاساكانی دەریـاوانـێتی‌و هێـڵی ئاسـمانی‌و كشت وكاڵ و هی‌تر.

٦ ـ لە هەنـدێ وڵاتـانـی موسـڵمانـیش دا پشت بە قورئـانی پیرۆز دەبـەسترێ بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری هاووڵاتیان و قورئان بە یاساو دەستوری سەرەكی دادەنرێ.

لە كۆتـاییدا دەڵێین یاسا مایەی ژیـانی ئاسـوودەو خۆشگـوزەرانی ئادەمیـزادە، ئەگینـا بەرەڵایی باڵ بەسەر ڕەگەزی ئادەمیزادا دەگرێ‌و هەمـوو ڕەوشت و داب و نەریتێك بەرەو هەڵدێری هەزار بە هەزار خل دەبێتـەوەو ژیـان هیـچ مانـایـەكی شارستانیتی تێدا نامێنێ.

**ئامادەكردنی: هاشم جەباری**

# پەیوەندی هەنگ بە هۆرمۆنی «ئیدرنالین»ەوە



لەراستیدا جیهانی هۆرمۆن جیهانێکی سەرسوڕهێنەرە، جیهانێکی پڕ لە حەپەسان و سەرنج ڕاکێشە، هۆرمۆنەکان چەند شلەیەکی لەشی جۆراوجۆرن.

لەهەموو کون و قوژبنێکی لەشی مرۆڤ و گیان لەبەرانی بڕبڕەداویی بڕبڕەکانیش دا دێن‌ودەچن، هۆرمۆن لەشوێنی دروست بوونیدا دەردەچێت و دەڕوات بەرەو ئەو ئامانجانەی دەیەوێت بیگاتێ، ئەمەش لەڕێگەی کۆئەندامی سوڕەوە ڕوودەدات، لەکاتی ئەم گوێزانەوەیەیدا هۆرمۆنەکان کاری سیحری خۆیان لە لەش دا جێبەجێ دەکەن.

لێرەدا زیادەڕەوی نی‌یە گەر بڵێین هۆرمۆنەکان لێ‌پرسراون لەئاراستەکردنی تێکرای چالاکی‌یەکانی لەشی مرۆڤ.. بەکورتی هۆرمۆن دیمەنی گشتی کەسێك ـ کێش و، قەبارەو، ڕەنگ و پێك هاتنی دیاری دەکات، دەست دەگرێت بەسەر تێکرای‌فرمانی ئەندامەکانی‌و بەشداری دەکات لەپێك هاتنی لەشی ـ ئێسك و گۆشت و خوێن ـ سەرەڕای ئەمانەش دەوری گرنگی هۆرمۆنەکان لەوەدایە کە ڕوخسارەکانی کەسێتی کەسێك دیاری دەکات، ئەمەش لەڕێی ڕێك خستنی زۆر دیاردەی دەروونی وەك هەڵ چوون، هاندەر، غەریزەو ڕەفتاری تری زۆر.

وشەی هۆرمۆن لەئەسڵ دا وشەیەکی یۆنانی‌یە **opuaw** واتە: هاندەرو ڕوژێنەر، پاڵنەر، بەڵام هۆرمۆن بە زمانی کیمیاوی یانی زیندوو لەبەشێکی دیاری‌کراوی لەش دا بەرهەم دێت و دەچێتە ناو کۆئەندامی سوڕەوەو خوێنیش هەڵی دەگرێت، دوور، یا نزیك بۆ شانەکانی لەش و ئەندامە جیاوازەکانی تری دەبات، بەو کارەی‌تەئسیر لەوشانەو ئەندامانە دەکات.

جا یەکێك لەو حاڵەتە دەروونیانەی مرۆڤ کە دەبێتە هۆی دەردانی هۆرمۆن حاڵەتی ترە.. لەکاتێك دا کە کەسێك دەترسیت هۆرمۆنی (ئیدرنالین)دەردەدات، جا لە ڕاستیدا هەنگ تام وبۆی ئەم چەشنە هۆرمۆنەی بە لاوە پەسەندەو حەزی لێ‌دەکات. بۆیە ئەو کەسەی کە لە پوورەیەك هەنگ نزیك بێتەوەو لەو کاتەش دا بترسێت هەنگەکان زیاتر لەو کەسە دەئاڵێن و بۆی دەچن، تا زیاتر بترسێت و هەڵبێت ئەوان زیاتر بۆی دەچن، چونکە ئەو هۆرمۆنە ڕێژەی لە لەش دا لەرادەی خۆی زیاتر دەبێت. ئەمەش بۆ ئەوەیە تا ئەو کەسە بۆ ئەو ئەزمەیە خۆی ئامادە بکات و هەڵوێستی خۆی وەربگرێت، بۆیە ئەم هۆرمۆنە ناونراوە (هۆرمۆنی هەڵاتن الهروب).

زانای فسیولۆجی بەناوبانگ«واڵتر کانون» لەگەڵ دکتۆر «دی لابازی»هاوڕێی ساڵی ١٩١١ پەیوەندی نێوان ترس و هەڵچوون و هۆرمۆنی ئیدرنالینی ئاشکراکرد، ئەم دووزانایە ئەوەیان تێ‌بینی کرد، کەهەڵچوونی ترس، بڕێکی زۆر لەهۆرمۆنی ئیدرنالین لەناو خوێنی گیان لەبەردا زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی ڕادەی شەکر لە خوێن دا.

ئازاد رئووف عارف قەزاز

# چەند ئامۆژگارییەك دەربارەی کاری فریاگوزاری

هەڵسان بەکاری فریاگوزاری لە کاتی تەنگانەدا دەلالـەتی هەستی بەرزی مرۆڤـایـەتی ئەو کەسە بەم کارە پیرۆزە هەڵـدەستێ، شایانی رێزە چونکە لەوانـەیە هەوڵەکەی بەفیرۆ نەروات و ببێتە مایەی‌رزگار کردنی لێقـەومـاوەکـە لە چنگی مردن و، ئەوسـا چەنـد ئافـەرین و سوپاسی فریاکەرەکە بکرێت هێشتا زۆر کەم دەبـێ لەچـاو ئەو کارە مرۆڤـایەتیەی نواندی جا بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی بەکاری فریاگوزاری هەڵـدەسـتـن بزانـن چۆن چۆنـی هەڵس و کەوت بکـەن لەکـاتـی چاوکـەوتنیـان بە لێقـەومـاوێك لە هۆشی خۆی چووە ، یا خنکاوە ، یا سووتـاوە ، یا .. هتـد ، بە پێـویـسـتـمـان زانی لێرەدا چەنـد ئامۆژگاریەکیان پێشکەش بکەین تا کارە پیرۆزەکـەیـان بە سەرکەوتووانەوە ئەنجام بگەیەنن :

١) - پێویستە لە کاتی راپەراندنی کاری فریـاگـوزاریەکە زۆر هێمن بێ‌و قەت نەپشۆکێت.

٢) - پێـویستـە پێشـەکی زانیـاری دەربـارەی جۆری کارەسـاتـی لێقـەومـاوەکـە پەیدا بکات، ئەوسا دەست بە راپـەرانـدنی ئەرکی سەرشانی بکات.

٣) - تا دەتوانی دەبێ ئاگات لەباری دەروونی لێقـەوماوەکـەو کەس و کارەکەی بێت و دەبێ هەوڵی هێمن کردنەوە بدەیت و متمانەیان پێ ببەخشیت.

٤) - پێـویستـە فەحسێکی خێرایی لێقـەومـاوەکـە بکەیت پێش ئەوەی دەست بە کارەکـە بکـەیت و، لەم بوارەدا دەبـێ ئاگـادار بی ئەوەك ئەزیەتی بدەیت



چۆنێتی هەناسە پێکردن

٥) - هەوڵی ئەوە بدە قەت لەبەردەم لێقـەومـاوەکـەو کەس وکـارەکـەی دەربـارەی رادەی مەتـرسـی کارەسـاتـەکە نەدوێیت، بۆ ئەوەی لێقەوماوەکە هەڵس و کەوتی نارێك نەکات

٦) - هەوڵ بدە لێهـاتـوویی‌و زیرەکی خۆت بنوێنی لە راپەراندنی



لەکاتی خنکاندن

کارەکـەت و ئەرکەکانی سەرشانت بەرامبەر لێقەوماوەکە.

٧) - ئەگەر هات و بەگومان بووی لەوەی لێقـەومـاوەکـە زینـدووە، یامـردووە ئەوسـا دەبێ بە شێوەیەك لەگەڵ لێقەوماوەکە هەڵس و کەوت بکـەیت وەك ئەوەی زینـدوو بێ‌و پێـویستی بە یارمەتی‌و فریاگوزاری هەبێ

٨) - هەوڵ بدە خەڵکی لە شوێنی کارەسـانـەکـە دوور بخـەیتـەوە بۆ ئەوەی بە ئاسـانـی کارەکـەت جێبەجێ بکەیت.

٩) - هەوڵ بدە ناو دەمـی لێقەوماوەکە پاك بکەیت و ، ئەگەر هات و تاخمی ددانی هەبوو ئەوسا دەبێ لەدەمی دەربکرێت بۆ ئەوەی رێگای هەناسەدانی ئاسان بێ.

١٠) - دوگمـەکـانی کراسـەکـەی بترازێنـە بۆ ئەوەی رێـگـا لە هەناسەدانی نەگرن

١١) - ئەگەر هات و لێقەوماوەکە دەستی یا قاچی شکـاو بێ، ئەوسا نابێ رایبکێشی، بەڵکو دەبێ لەگەڵ چەنـد کەسێکی‌تـر بە ئەسپایی‌و لەسەرخۆ هەڵیگرن.

١٢) - پێـویستـە هەر چەند دەققە جارێك دەست بخەیتە ژێر مەمکی لای چەپی سنگی لێقـەومـاوەکە بۆ ئەوەی بزانـی دڵی کاردەکـات و لە لێدان نەکەوتووە، جا ئەگەر هات و دڵی لە لێدان کەوت ئەوسا دەبێ بە هەردوو دەستت بۆ چەنـد جارێك سەر دڵی بشێلیت و، هەروەهـا پێـویستـە هەر چەنـد دەقە جارێك دەست بخەیتە سەر دەماری دەستی لێقەوماوەکە، یا دەماری لاملی ، بۆ ئەوەی بزانی ترپـەی لێـدانی دڵی

چەندەو ، نابێ ئەو ترپانە لە (٧٠ -٧٤) ترپە لەیەك دەقە کەمتر بێ.

١٣) - نابێ هیچ ئاوو خوارکێك بە لێقەوماوەکە بدرێت نەوەك پێی برشێتەوە ، یا بچێتە ناو سیستەمی هەناسەدانی.

١٤) - ئەگەر هات و جل و بەرگە و جەستەی لێقەوماوەکە ئاگری تێ بەربووبێ، ئەوسا نابێ ئاو بەسەریدا بکرێت ، بەڵکو دەبێ بە بەتانییەکی تەڕ بەسەر شوێنی ئاگر تێ بەر بووەکە بدرێت، یا داوای لێبکرێت خۆی لەناو خۆڵدا بگوزێنێت، چونکە ئەم دوو کارە ڕێگای هەواو ئۆکسجین لە ئاگرەکە دەبڕێت.

١٥) - پێویستە لەکاتی گواستنەوەی لێقەوماوەکە بۆ خەستەخانە لەسەر لابخەوێنرێت نەك لەسەر دەم یا پشت، چونکە ڕێگای هەناسەدانی لێدەبڕێت.

١٦) - ئەگەر هات و لێقەوماوەکە بە هۆی هەڵمژینی غازەوە، یا مەلەوانییەوە خنکا بێ، ئەوسا دەبێ هەناسەدانی اصطناعی (قبلة الحیاة) بۆ بکەیت

١٧) - ئەگەر هات و لێقەوماوەکە برینداربوویێو، ئەو خوێنەی لە برینەکەی دێتە دەرەوە ڕەنگەکەی سوور کاڵ بێو بربر بێتە دەرەوە ئەوا دەماری خوێن هێنەری لێقەوماوەکە (الشریان) تووشی نەزیف بووەو دەبێ بە پارچە بەنێك، یا پارچە پەڕۆیەك، سەرەوەی برینەکە شەتەك بدرێت تا خوێنێکی زۆر لە کیسەی لێقەوماوەکە نەچێت، بەڵام ئەگەر هات و ئەو خوێنەی لە برینەکەی دێتە دەرەوە ڕەنگەکەی سوورێکی مەیلەوە خەست و بە شێوەی بەردەوام بێتە دەرەوە، ئەوا دەماری خوێن گەڕێنەرەوەی (الورید) لێقەوماوەکە تووشی نەزیف بووەو، ئەوسا دەبێ بە پارچە بە نێك ، یا پارچە پەڕۆیەك خوارەوەی برینەکە شەتەك بدرێت تا خوێنێکی زۆر لە کیسەی لێقەوماوکە نەچێت.



بەتانییەکی تەڕ بدە بەسەر شوێنی ئاگر تێبەربووەکە

١٨) - ئەگەر هات و حاڵەتی لێقەوماوکە پێویستی بەوە کرد بەرەو خەستەخانە بگوازرێت ، ئەوا تەلەفۆن بۆ بەشی فریاگوزاری خەستەخانەکە بکەو، لەگەڵ پیاوانی بەشی فریاگوزاری هاریکاری بکە لە هەڵگرتن و گواستنەوەی لێقەوماوەکە بۆ خەستەخانە، جا دەبێ قەت ئەوەت لەبیر نەچێ کەوا کاری فریاگوزاری تۆ لەگەڵ هاتنی دکتۆرو کارگێڕانی بەشی فریاگوزاری تەواو دەبێو ، ئەوسا نابێ دەست بخەیتە ناو کاروباریان و، نابێ ئەمەرو فەرمان بە سەریاندا بسەپێنی، چونکە ئەمانە باشتر دەزانن حاڵەتی لێقەوماوەکە پێویستی بە چ جۆرە یارمەتیو خزمەتی پزیشکی دەکات.

عادل گەرمیانی

# قوڕ بۆ چارەسەرکردن و نوێ کردنەوەی گەنجایەتی

هەر چەندە ناونیشانەکە جێگای سەرسوڕمانە بەڵام ڕاستییەکی زانستییە لە لایەن زانستانی پزیشکی تایبەت بە دەمارو نەخۆشیەکانی پێست دۆزراوەتەوە هەندێك جۆرە (قوڕ) ی سروشتی دەتوانن خانەی مردوو لە لەشی ئادەمیزاد لابەرن هەروەها بۆ لەش خاوبوونەوەو نەخۆشی ماسوولکەکان بەتایبەتی ئەو ماسوولکانەی کە گرژبوونەتەوە لە لەشی وەرزشەوانان و هەروەها سوودێکی زۆری هەیە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە هەست بە ئێشێکی بەردەوام دەکەن لە ڕۆماتیزم و جومگەکانی لەش و پشت ئێشان،

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ساڵێ نزیکەی پەنجا هەزار فەرەنسی ڕوودەکەنە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی چارەسەرکردنی سروشتی بە قوڕ (العلاج الطبیعي بالطین) کە ماوەی مانەوەیان لەم نەخۆشخانەیەدا نزیکەی (١٥) پانزە ڕۆژ دەخایەنێ کە ئەمیش درێژبوونیان لە ناو حەوزێکی پڕ قوڕە کە ئەم کارەش بە چاوەدێری پزیشکی تایبەتی بۆ چەند جارێك بە ئەنجام دەگەیەندرێو پلەی گەرمی ئەم حەوزەش لە نێوان (٣٨ - ٤٤) پلەی ئاوی سەدییە، ئەمە جۆرێکە لە چارەسەرکردنی نەخۆشی بە ڕێگەی حەوز. . بەڵام جۆری دووەمی لەش چەورکردنە بە قوڕ و هەروەها ئەم جۆرە قوڕە پزیشکیەی کە هەیە چەند جارێك پاك دەکرێتەوەو دەپاڵێورێو چەند ماددەیەکی پزیشکیو گیاو گوڵی لەگەڵ تێکەڵاو دەکرێ تاکو بۆ بەکارهێنانی سوود بەخش بێت. . .

ئەوەی شایانی باسە چارەسەری پزیشکی بە قوڕ شان بە شانی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانەیە کە بە ڕێگەی گەرماوەکانی ئاوی کوڵاو و ئاوی کانزایی کەبەر لە دەیان ساڵەوە ناوبانگی دەرکردووە لە زۆربەی شارەکانی جیهاندا بەکار دەهێنرێت. .

ئامادەکردنی: فیصل زامدار

# پێنج خشتەکی یەکی «صابری»و«ناری»

محمد جمیل رۆژبەیانی



صابر - یا- صابری، نازناوی شێخ نجم الدینی کوری شێخ نورەحمانی کوری شێخ مەحمودی بەرزنجییە ئەم شاعیرە خەڵکی گوندی «شۆریجە»ی ناوچەی قەرەحەسەنە خوابگای شێخ مەحمودی بابای لەگوندی شۆریجە زیارەتگای دەرویشان بوو، نەوەکانی بیست خێزانی ئەبوون هەموویان هەر لە شۆریجە بەکشت وکاڵەوە خەریك بوون. تەکیەومزگەوت لەئاواییەکەدا هەبوو، زۆر لە شێخەکان ئیوچە خوێندەوارییان هەبوو بەڵام ئاوایی مەلاو مامۆستای وانەبێژی تیا نەبووە. شێخ مەحمودی باپیری صابری چەندین کتێبی نووسیبووە باشترینی ئەوانە کتێبی (بحرالانساب)بوو کە داوێنێکی تەواوکار (ذیل تکمیلی)بوو بۆکتێبی (برء الآلام)ی شێخ محی الدینی قوولەی برازای شێخ حەسەنی گڵەزەردە. کەخوابگای ئێستە لە کەرکوکە وگۆرستانی گردی شێخ محيي الدين ناوی ئەو زیندو ئەهێڵێ. شێخ مەحمود لەم کتێبەیا ناوی زۆر لە خوێندەواران ومەلاو شێخان وناسراوانی ناوچەی قەرەحەسەن وجەباری ودەوروبەری کەرکوکی تیابردووە، بەداخەوە ئەم کتێبە فارسی یە تا ئێستا نەکراوەبە کوردی وچاپ نەکراوە، کەمرۆڤ بە هۆیەوە ناوی صەدان خوێندەوارو زاناو شاعری لەوەبەر بزانێ..

صابری بەمندالی قورآن وکتێبە سەرەتاییەکانی فارسی وعەرەبی وتورکی - وەکو سمایل نامە، ناگەهان، ئەحمەدی، گوڵستان، بۆستانی خوێندووە ولەخوێندەواری ئاینیشا«فتح القریب»و «عوامل»وشرح «موغني» خوێندووە، وبە زیرەکی خواکردی وسوروشتی بەدانیشتن لەکۆری مەلاوفەقێیان وزاناو وشاعران وگوێگرتن لە شیعرو هەڵبەست سەرچاوەی هەستی شاعریتی هەڵقوڵاوە وبووە بەهەستیارێکی باش . . شیعرەکوردی وفارسی یەکانی دڵداری وئایینی ودەرویشانە وئامۆژگاریانە ورەخنە ئامێزانەیە، حارجارە «ئایەت وحەدیث»یشی خستوتە ناو هەڵبەستەکانەوە و بۆئەوەی بزانێ کە جێی خۆیان گرتووە پارچە شیعرەکانی ناردووە بۆ مەلای گەورە - مەلا ئەحمەدیفەرقانی رۆژبیانی - کەپەسەنی بکات.

صابری پیاوێکی رەندو وقسەخۆش ونیکتەپەردا زبووە جارێکیان خانمی پێی ئەڵێت: ژێری چناگەت سپی بووە!.. ئەویش لەوەراما ئەڵێت: ئیمەپیمان خوشە ئیوە ژێری چناگەتان سپی بێت ئیوەبۆ پێتان ناخۆشە؟؟

هەروا جارێك بە ئافرەتێکی حەیات ناو کە بۆ دوعا ئەچێتەلای ئەڵێت: خوشکە حەیات حەیامان ها بە حەیاتەوە، هەروا کابرایێ کە لە دیوەخانی مامۆستا ئەچەمێتەوە کنەجغارەکان کۆبکاتەوە، ئەڵێت «عەظمم»!

ئەڵێی وشترمورغی مێرولە ئەچنی‌یەوە..

ئەم پێنج خشتەکیەمان لە بەیاضەکەی خوالێخۆشبو «بەهاء الدین نەقەندی»یا بەرچاو کەوت کە لەسەر پارچە هەڵبەستێکی «ناری»یە، بەباشمان زانی لەناونەچێ وشەیدایانی شیعری صابری یاد داشتی بکەن وبیخەنەسەردیوانەکەی کە چەند ساڵێ لەمەوبەر لەلایەن کەسانیکەوە لە چاپ دراوە فارسی و زاراوەی ئایینی ناشارەزا بوون وەهەڵەیان زۆر تیا هێشتوتەوە، ئێستەئیوەو پێنج خشتەکی یەکە:

دڵ لەچینی پەرچەمت ئەمشەو عەجەب هاواریە
تیری موژگە ی تیپی ئەبرۆو زوڵفی تۆ بەم سەححاریە!
چاوەرێی فەرمایشو ئەمرو نەهیی سەرداریە
«چاوەکەم من بۆیە دائم کارو پیشەم زاریە...
حاکمي چاوت لەگەڵ من مایلي غەدداریە»
هەروەکوبولبول دەناڵم دەم بەدەم لەم قاپیە
بەڵکی فەرمایش بکا جارێ کە ناڵینت چی‌یە؟



سەر لە سەودا دڵ لەغەم قەت ساعەتی خەڵوەت نی‌یە
«سۆزش و ناڵینی کەس بێ وەجەو بێ عیللەت نی‌یە!
ئاهی من فەریادی بولبول کاری بێ غەمخواریە»

شەوهەتا فەجرو سەحەر من مائلی شینم کەریم!
بێ دەوایـــە زامـــم وتـــوڵـــێنم مەپـــرســـەئـــەی حەکـیم!

پێی! بڵێ بەود لبەرە باری بەدڵسۆزیی نەسیم!
«مـــن لەئـــەورۆژە دەســـم شۆری لە ڕوحـــێ خۆم کەدیـم!

حەضرەتی خوانخواری ئەبروت مەشرەبی خوانخواری‌یە»
شەمسی ڕوخسارت بەقوربان! کەوتەبورجی پایزی

توی‌هیدایەت بەخشی عالەم لادەقوربان حاجزی!
گەربێ یار ڕەحمی من چیمە لەسایەی خانەزی

«گەردەپرسی بۆچی بێ نەشئەومەلول وعاجزی؟
ڕومەتی زەردم عەزیزم شاهیدی بێ یاریە»
زوڵفەکەی جادوو گەری تاراجە ئەم عەرعەرقەدە!

دڵ بەپەیکانی موژەی بیمارە دەستم لێ مەدە!
تۆکـــە نادەی مەرهەم‌لیم لادە دەردم پـــێ مـــەدە
«کەم بە خەندە بێ بەلاموحەیفە طەعنەم لێ مەدە!
لێم گەرێ تووبێ خوا ئەم جارە دەردم کاری‌یە»

جۆششی ناڵینی نەغمەی بولبولە دێ‌لەم شەوە
یاصەدایی عەسعەسی چین پەرچەمە لەم گۆشەوە؟
مەرحەمەت فەرمو بەقوربان حاری دادم بشنەوە!!
«دڵ لەشامی پەرچەمی تۆ دایە دائم بێ‌خەوە..
چونکە ئیشکچی لەشەودا عادەتی بیداری‌یە..
کەشفی‌بابی وەحەدەتی تۆ بێ تەئەمول کەی دەبێ؟
مونجەلی نابێ بە کەس ئەم گۆشە گەر شەرحی نەبـــێ
چی‌دەزانێ موعتەزل گەرمونکیری وصفی‌بێ؟
«حیکمەتی پڕ مەسئەلەی حوسنت لە بۆکێ حەل دەبێ؟
هەر صەحیفەی صەد ئیشارەو ڕەمزی تێدا جاری‌یە»
دڵبەرا لادە نیقابی شەوچرایی لەعلەکەت!
لازمە بۆشەو مەتالای خاڵی پاڵی کوڵمەکەت
بۆبەیانی حمدی ئەوصافی ڕموزی حوسنەکەت
«خاڵی ڕوخسارت«هدایەت» پەخشە شەرحی زوڵفەکەت
«قاضي»ئاسا حاشیەی ئەگریجەکانت «لاری»یە
چۆن نەناڵم؟ زامی دڵ ساکین نی‌یە ساتێ لە ئیش
کەس وەکو «صابر»نی‌یەبیمارو زارو دەردی‌ڕیش
غەرقی ناری فیرقەتم تادووری گەرخۆدیمەبیش
«رووت و کو ئاگر موژەت وەك شیش وئەبروت قیمەکیش
مروەحەت زوڵف وکەبابت جەرگی پارەی «ناری»یە

# «نەورۆزی ئەمڕۆو دوێنێ»

نووسینی د. عبدالستار طاهر شریف

> ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
> جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە
> – پیرەمێرد –

نامەوێ لە نووسینێکی واکورت دا لەگۆڤاری ڕەنگینی خۆشەویست بچمەناو بنج و بنەوانەی«نەورۆز» وەك جەژن یان وەك مێژوو، لەبەر ئەوەی چونەناو باسێکی واوە بەچەند لاپەڕەیێك کۆتایی پێنایێ بۆیە حەزدەکەم خوێنەری ئازیز ئەگەر بیەوێ مێشکی بە هەندێ زانیاری بەکەڵك لەسەر «نەورۆزی کوردستان» زاخاو بدا ئەوا دەتوانێ «داستانی نەورۆزو نەورۆزی کوردستان»ی مامۆستا حیلمی عەلی شەریف بخوێنێتەوە کە لە سەرەتای ئەمساڵ، ساڵی ١٩٩٢ کەوتۆتە بازارەوە.

زۆر بە پەلە چاوێکم بە گۆڤاری، گەلاوێژدا، خشاند لەژمارەکانی ساڵانی ١٩٣٩-١٩٤٢ چاوم بە هیچ نووسینێك نەکەوت دەربارەی. نەوروز یان شیعر لەسەر نەورۆز ئەمە وای لێکردم بیر لە نەورۆزی ئەمڕۆو دوێنێ بکەمەوە. پاشان لەژمارە(١)ی ساڵی - ٤- ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٣چاوم بە نووسینەکەی هێژا «محمد امین زکی بگ»کەوت کە بۆ پیرەمێردی خۆشەویستی نووسیوە. بەناونیشانی «نەورۆز»کە وێنەی بەشێك لەدەقی نووسینە کە بڵاو-دەکەمەوە لەم ژمارەیەی ڕەنگین دا. دوایەدوای نووسینەکەی ئەمین زەکی‌بەگ وادیارە گۆڤاری گەلاوێژ پێ دەنێ بەجەرگی خۆی‌داو دەرگای نووسین لەسەر نەورۆز یەکالا دەکاتەوەو لەژمارە (٣)ی ساڵی - ٤- ئاداری ساڵی ١٩٤٣. پیرەمێردی نەمر وەڵامی نووسینەکەی ئەمین زەکی بەگ دەداتەوە، لەژێر ناونیشانی «نەورۆز» کەوا وێنەی بەشێك لەدەقی نووسینەکەی پیرەمێردیش لێرەدا بڵاو دەکەینەوە. هەر لەهەمان ژمارەی (٣)دا گۆرانی نەورۆزانەی پیرەمێرد بلاوکراوەتەوە.

لێرەدا دەمەوێ بیمەسەر مەبەستم لە دانانی ناونیشانی نووسینەکەم «نەورۆزی ئەمڕۆو دوێنێ» ئاشکرایە لای هەموومان لە ساڵانی پێش شۆڕش چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨کاربەدەستانی عێراق ئاگرکردنەوەی نەورۆزیان قەدەغەکردبوو، بەڵام کورد ئاگری نەورۆزی خۆی لەشەوی نەورۆزدا هەر دەکردەوە لەسەر چیاو قەت پاڵەکانی کوردستان، ئاگری نەورۆز بڵێسەی بەرزدەبووەوەو ساڵ نەبوو چەند لاوێکی کورد لەسەر ئاگری نەورۆز لە گرتوخانەکان دا ئازارو ئەشکەنجە نەدرێن. وادیارە گۆڤاری گەلاوێژ ئەگەر بەچاو قایمی نەبوایە نەی دەتوانی ئەوچەند دێرەش لەسەر نەورۆز بڵاوبکاتەوە..

بەڵام دوای شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨گەلی کورد بەئازادی ئاگری نەورۆزی خۆی دەکردەوەو دوای بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ ئیتر نەورۆز کرا بە جەژنێکی ڕەسمی گەلی کوردو وەك جەژنێکی نەتەوەیی نەتەوەی کورد دانی پێدانرا ،دوای ئەوەی زیاتر لە حەفتا ساڵ بوو لەلایەن ڕژێمەکانی عێراقەوە بەجەژنی ئاگرپەرست لە قەڵەم دەدرا. باهەر بڵێسەی ئاگری نەورۆز بەرزو گەشاوێ.

## نوروز

بە قەلەمی محمد امین زکی بگ

هەمو ئەزانین کە هەمو ساڵێك زەمانە تکێکی بچوك و یا گەورە بو ئەم جەژنی طبیعەتە ئەکێ. چەندێ پێکێ، ئەم ئیکرو ... باشەی تو تێ نوگەیشتن و بوحتاتی پسنڵێن تێ کرچێ و بوپەیکێ باسیان لێدا و تمیان هیقت لەسەر ئەم تەکرە بردی. زور ناحق بون چونکە ئەم روژە، بە پێی ئەوە کە اول روژی بهارە، و سەرکێوی ژیانەوەی طبیعت ئەدا، بو هەمو آدەمیزاد جەژنێکی راستەقینەیە ولایقە کە هەموکس تقدیسی بکا و سبدێکی زور پاك‌و طبیعی ساڵی تازەیە. پیغەبانی ولاتانی شرق، ئەم روەوە بە بارکان داناوە و انواعی تەماونگە ویاریان بو کردوە.

ایران، کە لەزور قدیمدا مفهومی جلالی آثار طبیعیە بوو ئەی بەرەتی، ئەم روژی نوروزەی لە هەمو زیاتر تقدیس کردوە چونکە بدأی ژیانەوەی حیات و طبیعتە. وەکو بعضێکی ادعا ئەکەن، کە (نوروز) جەژنی آتشپرست نیە و تانی ... و جی‌ی ... بدربێ. جەژنی دوژمنەوەیی آگر، ... شانامە، ئەبێ (جشن سده) بێ. فردوسی، ... (هوشنگ) دا ... روژێك ئەم پادشاهە ... ئەچی بو

## نەوروز

پیرە مێرد

نوری دیدەی من و ولاتەکەم امین‌زکی بگ لە گەلاوێژی جاری پێشوودا لە نوروزی من دوابو. دیارە ایە بە بەرزی ئەوا راناگەین بەلام گولەوەچنی دریغ نەکراوە، ئەوا ئەمجارە گولەوەچنی ئەو بەرزی ئەکەم و لە نوروز ئەدویم.

نەوروز، روژی نوی روژی یەکەمی (فروردین) باستانی و نوی مارتی کونی رومی و ٢٢ ی مارتی فەرەنگ کە ئەمساڵ ئەکەویتە شازدەی (ربیع اول) کە ربیعیش بەکوردی بەهارە وچوار روژ دوای مولودی پێغەمبەر گەورەکەمانە سەری ساڵی تازەی روژ هەلاتیەکانە ئەو خدایەی کە ئەم دەورو چەرخەی چەرخی داناوە (قرآن) دا لە (سورە یونس آیتی پێنجەم) دا ئەفەرمویە «هو الذی جعل الشمس ضیاء والقمر نوراً وقدره منازل لتعلموا عدد السنین والحساب» ئەم حسابە وژمارەیە زور ئەستیرەناسان لێکیان داوەتەوە و اول ژمارەکەر وئەستیرەناس (شیث) کوری آدم و دوای ئەو (ادریس)ی پیغمبر کەخوێندکە بە (آخنوخ)ی ناو ئەبەن ئەلێ (سپهر) آسمان دوازدە کەلوی هەیە (برج) هەر کەلویەك (٣٠) ریبازە ئەم روژە هەر مانگی ئەبەرێتە کەلویەکەوە و هەر روژ

# بارانی رەش لە وڵاتی خۆرهەڵاتوودا!..




فلیمی(بارانی رەش لە وڵاتی خۆر هەڵاتوودا)تا رادەیەك توانیویەتی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت ،چونکە وەکو فلیمە ئەمەریکییەکانی‌تر تەنیا لە ئەمەریکا وێنەی نەکێشراوە بەڵکو زۆربەی دیمەنەکانی لە نێو ئەو وڵاتەدا گیراوە کە پێوەندی بە رووداوی چیرۆکەکەوە هەیە. لێرەش مەبەستمان ژاپۆنە.. کە ئاکاری ئابووری‌و ژیاریی ئەم وڵاتە زۆر بە رێك وپێکی دەخاتە روو و بینەران لە ئاستی‌دا سەرمەست دەبن. دوگلاس لە نیویۆرك تاوانبارێکی ژاپۆنی دەگرێت ، کە دەیباتەوە بۆ (ژاپۆن)بۆ ئەوەی دادگای ژاپۆنی سزای بدات ، لەفرگەیەکی ژاپۆنی‌دا ، تاوانبار بە فێڵێك دەرباز دەبێت ئیتر دوگلاس بۆ ئەوەی لە لایەن دەزگای ئەمەریکی‌وە تاوانبار نەکرێت بەدوای کابرای هەڵاتوو دەکەوێت ، فلیمەکە شێوەی راوراوانییەکی پۆلیسی دەنوێنێت کە دوگلاس لەم راوراونییەدا نەریتی تایبەتی هەڵس وکەوتی گەلی ژاپۆنی رەچاو ناکات. کاتێك دوگلاس روو بەرووی لە سەرۆکەکانی ئەم تاوانبارە دەبێتەوە کەوا سەر بە رێکخراوێکی تایبەتین، سەرۆکەکە روو لە دوگلاس دەکات و پێی دەڵێت:

ئەی جەردەینە(ئەمەریکا) من کە تەمەنم دە ساڵان بوو بەچاوی خۆم بینیم فرۆکەکانتان چۆن شارەکان ئێمەیان بۆردومان دەکرد، لە ٦و٩ی ئابی‌ساڵی ١٩٤٥دا چۆن هەردوو شارەکەی ئێمەتان - هیرۆشیماو ناکازاکی بە بۆمبای ئەتۆم بۆردومان کرد کە ١٦٠ هەزار کەستان کوشت و ٢٠٠هەزار کەسی تریشتان بریندار کرد ئەم رۆژە بارانی دونیا بەگشتی بەهۆی هەڵگەڕاو بەسەر خەڵکی بێ [illegible]ـلات و بێ تاوان دا باری بەم [illegible] تۆڵەتان لێ دەکەینەوە.

ئەوەی شایانی باسە ئێستا جەنگێکی ئابووری گەورە لە نێوان ئەمەریکاو ژاپۆن دا بەرپا بووە .کە ژاپۆنی‌یەکان دەیانەوێت بە بەرهەمی زیاد بازارەکانی جیهان داگیر بکەن. ئەم فلیمەش روون کردنەوەیەکی تری ئەم جەنگەیە کەوا ئەم کۆمەڵە رێکخراوە تایبەتی‌یە .. پیشەی دروست کردنی دۆلاریان گرتووەتە دەست، تاکو نرخی دۆلار لە بازارەکانی پارە، بەرانبەر (ین)ی ژاپۆنی‌دا زیاتر دابەزێت.

سەرچاوە:

**AI CINEMA WAL NAS**
**.NO 192 . 1990**

فوزیە ولي

## جیهانێکی سەیر و سەمەرە

### شارێك لەژێر زەوی‌دا

لەبەر زۆریی دانیشتووان و پەرەسەندنی مەترسی بوومەلەرزەو لافاو، لەو چەندانەدا ژاپۆن بیری لە نەخشەییکی تازە کردەوە بۆ دروست کردنی شار لەژێر زەوی‌دا، . . لەو شارەدا کە ژاپۆن بڕیاری دروست کردنی داوە، چەندان سەرچاوەی وزەو میوانخانەو نووسینگەی کارگێری‌و خانووی نیشتەجێ‌کردن دروست دەکرێ کە بەدرێژایی ٥٠ - مەتر دەکەوێتە ژێر زەوی.

دروست کردنی ئەم شارە وەك زانراوە نزیکەی حەوت ساڵ دەخایەنێ، هەروەها حەفتا ملیۆن پاوەنیشی تێ‌دەچێ. .

ئەو خانووانەی لەم شارەدا دروست دەکرێن لە شێوەی گومبەتن و پانیان ٥٠ مەترو بلندیان ٣٠ - مەترەو ٨٠ مەتریش لەزەوی دوورن.

شایەنی باسە کە ئەو پارەیەی لەم جۆرە شارانەدا سەرف دەکرێ - دووقات و سێ‌قاتی ئەو پارەیەیە کە بۆ دروست کردنی شارێکی سەر ڕووی زەوی تەرخان دەکرێت.

بەڕێوەبەری گشتی ئەم کۆمپانیایەی ئەم شارە بنیات دەنێ دەڵێ: لە ساڵی ٢٠٠٠ - دا نزیکەی لە ٧٠٪ ژاپۆنی‌یەکان لەژێر زەوی‌دا دەژین!

ئامادەکردنی: یاسین طه

## لویـد جۆرجی شەشەم



شەوێك لە شەوان لوید جۆرج سەرەك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا

لە گوندێك لە گوندەکانی لەندەن بە گەڕێنەکەی (ئۆتۆمبیلەکەی)دەگەڕا تا بەنزینی گەڕێنە کەی تەواو بوو

نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ لەندەن. وای بە باش زانی شوێنێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە تا ئەو

شەوە لەوێ بخەوێ خانوویێکی گەورەی بینی وای زانی قەسرێکەو لێی نزیك بووەو لە دەرگای دا . .

خزمەتکارێك هاتە بەر دەرگاو پێی وت فەرموو چیت دەوێ؟

لوید جۆرج پێی وت . . . دەمەوێ ئەم شەو لێرە بخەوم چونکە بەنزینی گەڕینەکەم تەواو بووەو ناتوانم بگەڕێمەوە.

خزمەتکارەکە پێی وت: - ئێرە ئوتێل یاخود ماڵ نی‌یە، بەڵکو نەخۆشخانەی شێتانە.

لوید جۆرج وتی قەی ناکا من دەمەوێ لێرە بخەوم حەز دەکەم خۆمت پێ بناسێنم من لوید جۆرجم سەرەك وەزیرانی پێشووی بەریتانیام. .

خزمەتکارەکە پێی ووت ،کەواتە فەرموو. لێرە پێنج کەس هەیە هەر یەکێك لەوانە دەڵێ من لوید جۆرجم تۆش وەرە ببە بە لوید جورجی شەشەم. .

ئامادەکردنی:
دڵشاد ایوب سعید

## « وتەی بەنرخ»

١- «زۆر تۆوی ئارەزوو ئەچێنرێ، بەڵام بەرەکەی کەم ئەدوورێتەوە»

(ڕینال زویی)

٢- «ئەشێ مێشولەیەك چزە لە ئەسپێکی ڕەسەن هەڵێنێ بەڵام مێشولەکە هەر مێشولەیەو ئەسپە ڕەسەنەکەش هەر بەرەسەنی دەمێنێتەوە».

(میخائیل نەعیمە)

٣- «پیاو بەکردەوە ی‌دا بناسە نەك بە قسە، چونکە زۆر پیاو قسەی جوان و کردەوەی ناشرین ئەکەن»

(تۆلستوی)

٤- «هەموو ئافرەتێکی جوان مەرج نی‌یە چاك بێت ، بەڵام هەمو ئافرەتێکی چاك جوانە»

(بلزاك)

هاوڕێ ڕەنگین رقیب سعید

## تاقی کردنەوە

### بۆ ڕابواردن و زانیاری

١ - چۆن فوارە (نافورە) دروست بکەیت؟

- شووشەیەکی بچووك تاسێ چارەکی پڕ بکە لە ئاو -

- کونێکی بچوك بکەرە تەبەدوورەکەی یان سەرقاپەکەی.

- (قامیشێك) لە وانەی وەك (ماکەڕۆنەی باریکە) (و ئاوو ساردەمەنی پێ دەخۆنەوە) بخەرە ناو شووشەکە لە کونی سەرقاپەکەیەوە تا نزیك بنەکەی دەبێتەوەو سەرەکەشی نزیك دەمەکەی.

- پارچەیەك کاغەزی نشاف چەند جارێك قەدبکە جا لە ئاوی هەڵ بکێشە.

- ئەم نشافە تەرە بخەرە سەرقاپێك. جا شووشەکەی بخەرە سەر.

- شوشەیەکی بەتاڵی مرەبا پڕبکە لە ئاوی گەرم (بەڵام وریا بە وا گەرم نەبێت شوشەکە بشکێنێت. شوشەکە بەتاڵ بکە.

- ئەم شووشەیە بە هەڵەو گێڕاوەیی بکە بە سەر شووشەکەی پێشوودا.

- دەست بنێ بەسەر شووشەی مرەباکەدا تا قورسایی بکەوێتە سەر کاغەزە (نشافەکە) هەڵمژەکە.

- کاتێ شووشەی مرەباکە سارد دەبێتەوە، ئەو بۆشایی‌یە (فراغ) ە کە پەیدا دەبێت وا لە ئاوی ناو شووشە گەورەکە دەکات وەك فوارە سەرکەوێت.

## قسەکردن بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە

لە ساڵی داهاتووەوە دەزگایەکی هێڵی فرینی ئەورووپایی خەریکە کارێك بکات بۆ ئەوەی هەر کەسێك کە سواری فڕۆکە بوو بتوانێ بە کەیفی خۆی بۆ هەر کوێیەك بیەوێ بە تەلەفۆن قسە بکات. ئەمەش کەوا لە هەر کورسییەك دا تەلەفۆنێك چەسپ کراوە و بە هۆی بەشدار بوونی دەزگاکە لە سیستەمی پێوەندیی مانگە دەستکردەکانەوە تەلەفۆن لەم لاو لەولای جیهان وەردەگرێ.

هێڵە ئاسمانییەکانی بەریتانیا ساڵی داهاتوو ئەم سیستەمە بەجێ دەهێنێ و بەوهیوایە سەد کەس لەسەر فڕۆکەوە بتوانن لەیەك کات دا بۆ بیست شوێن تەلەفۆن بکەن.



## لە وتەکانی شێکسبیر

* پیاوی ئازایەك جار دەمرێ، بەڵام ترسنۆك سەد جار دەمرێ..
* ئازایەتی ئەوە نییە تۆڵە بکەیتەوە بەڵکو ئەوەیە کە تەحەمول و سەبرت هەبێ..
* کاتێ کە ئازایەتی بەسەر عەقڵا سەردەکەوێ، ئیتر ئەو شمشێرەی کە شەڕی پێ دەکەین دەشکێ
* چاك و خراپ نییە، تەنها ئەوەنەیێکە ئەبێ لەبیردا هەبێ، کەبڕیاردرائیتر یەکێکیانە
* برادەری لە هەموو شتێك دا بەردەوامە تەنها کارو خۆشەویستی نەبێت.
* من کاتم لەناوبرد، بەڵام ئێستا کات منی لەناوبرد.

## دەربارەی ئافرەت ئەڵێن...!!



* ماڵ بەبێ ئافرەت قەبرستانە..

(غاندي)

* ئەو ئافرەتەی مێردەکەی خۆش دەوێ، دەیکاتە سوپایەك بەرگری لێدەکا..

- غۆرمان -

* پیاوە مەزنەکان مەزنایەتیەکەیان لە دایکیانەوە بۆ ماوەتەوە..

- پلیشییە -

* پیاو لە منداڵیدا دایکی چۆن فێری بکات، گەورەش بێت هەروەها دەبێت..

- قاسم ئەمین -

*ئەگەر هەستت کرد لەم جیهانەدا، لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا تۆتەنها یەك کەست پێویستە، ئەوە ئیتر تۆعاشقی

لامارتین



## ماچ.. چییە ؟

دختۆریکی سویدی لە رۆژنامەی «لاترسیرا»دا نووسیویە ماچ بۆ دڵ و بۆ لەش بەکەڵکە. چونکە دژە ـ لەشی وا پەیدا دەکات کە لە ماوەیەکی درێژدا دەبنە هۆی دروست بوونی بەرگریی لەش.. هەروەها ماچ دڵ بەگوڕ دەخات و لە ئەنجام دا زیاتر هەوا دەچێتە ناو شانەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی (نوێبوونەوەی) لاویی ئەو کەسانەی لە سەنعەتی ماچ ماچێنێدا کاردەکەن!!

بەڵام، تۆبڵێی ئەمە بانگەوازی ماچ کردن نەبێت؟ هەر خوا خۆی دەزانێ.

---

٢ ـ پارەیەك وەك پەنجا فلسی لەسەر مێزێك دابنێ.

- شووشەیەکی وەك (بطل) هەڵگێرەوە بەسەریدا.

بزانە دتوانیت پارەکە لە ژێر شووشەکە دەر بهێنیت بێ ئەوەی دەست لە هیچیان بدەیت؟

- یەك دوو مستەکۆڵە بەسەر مێزەکەدا بدە تزیێك لە دەمی شووشەکەوە بڕوانە وردەوردە شووشەکە لەسەر پارەکە دەڕوات و لادەچێت.

(بەڵام وریایە مستەکۆڵەکانت وانەبێت دەستت ومێزەکەو شووشەکەش بشکێنێت).

### ئەناتۆل فرانس وتویە:

چاکترین بەرهەمم ئەوانە بوون کەمترین کریاریان هەبووە وەك (جان دارك) و (مێژووی گاڵتەچی) و خراپترین بەرهەمم ئەوانە بوون کە هەمووکەس مەدحیان کردوون وەك: (تاییس) و گوڵاڵەسوورە.

کریستۆفەر مورلی وتویە

تا نەبیبە گوێگرێکی باش..
نابیبە قسەکەرێکی باش.

- رەخنەگر ئەو کەسەیە کە هەر شتێکی خراپ دەدۆزێتەوە لە چاکترین شتدا.

- تایەی (سپێر) ئەوەی کە پاش ئەوەی پەنجەرت دەبێت فووی تێدەکەیت.؟

- میوانخانە (لای منداڵ) ـ ئەو جێگەیەیە کە ناچار بۆی دەچیت کاتی ئامۆزاو خزمت نابێت.؟

- منداڵی لاسار کەمترین کەسە بەڵام گەورەترین کێشەیە.

- ڕێگەی کورت ئەوەیە کە کەسی لێنابینیت تا لێی بپرسیت لە کوێیت؟

- مۆمێك، پارچەیەك گۆشت، تۆزێك قوڕ، چەند گوێزانێك پێکەوە بخەرە سەر ئاگر، بڕوانە: مۆمەکە دەتویەتەوە ـ گۆشت و قوڕەکە دەبرژێن و رەق دەبن، گوێزانەکان سوور هەڵدەگەڕێن دەبریسکێنەوە. هەروەها چەند کەس لە ژێر هەمان ئاو هەوادا هەریەکە بە جۆرێك دەبێت. یەکێکیان گورج و بەهێز، یەکێکیان زۆر لاوازو بێ هێز، سێیەمین دەمرێت.

(لە ئەفسانەی هۆفمان)

# لە ئاسۆی هونەری ئاسکەوە...

شۆخی نازدار مدیحەکامل ـ بۆ یەکەمین جار لە فلیمی ـالعفاریت ـدا گۆرانی دەڵێت. . لە کاتی وێنە کێشانی فلیمەکەدا چەند گیرو گرفتێک لە نێوان نەقابەی مۆسیقاسازان و ـ مدیحە کامل ـدا ڕوویداوە کە گوایە بەر لەوەی گۆرانی بڵێت پێویستە ئاگاداری نەقابە بکات ، ڕووداوی فلیمەکەش ئەوەیە کە کۆمەڵە منداڵێک لەدایک و باوکیان دادەبڕێن و لە نێو شەقامەکان دا بە سواڵکەری دەمێننەوەو ئازاری خەڵك دەدەن.

ئەستێرەی بانگاشەی میسری ـ لمیاء الجداوی ـ بڕیاریدا واز لە جیوانی بانگاشە(دیعایە) بهێنێت و روو لە نواندنی سینەمایی بکات بۆ ئەمەیش دەرهێنەری بەناوبانگی میسری ـ علی بدرخان ـ پێشنیاری کردووە کە دەورێکی لە فلیمێکی سیاسی بداتێ‌و تاقی بکاتەوە ئەوەی شایانی باسە ـ لمیاء الجداوی ـ لە تیپی گەلی هونەرە میللی‌یەکان بەشداری کردووەو ئێستاش پەردەی ـ سینەمای ـ ـ میسری ـ چاوەڕوانی چەند دەورێکی ئەم زارڤەکەرە



لیلی علوی



مدیحة کامل



لمیاء الجداوی



مارلین مۆنرۆ

ناسکەیە . . !!

ئەستێرە گەشەی جیهانی پەردەی سینەمای عەرەبی شۆخی لێهاتوو - لیلی علوي - کۆتایی بە وێنەکێشانی فلیمێکی گرنگە هێنا بە ناونیشانی - اولاد الغواری - فلیمەکە لە ژیانی گشتی باری کۆمەڵایەتی گەلی - میسر - پێش شۆڕش دەدوێت هەروەها لەم فلیمەدا هونەرمەند - أحمد زکی - ش - بەشداری دەکات

سەرەڕای ئەوەی کە چەند ساڵە - مارلین مۆنرۆ - مردووە بەڵام هێشتا هەر زیندووە وێنەکانی بەرگ و ناوەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی داگیر کردووە، ماوەیەکە مێردەکەی - ئارثرمیللر - ڕۆمانێکی بەدەستەوەیەو زۆربەی بەشەکانی بۆ ژیان و هونەری ئەم شۆخە تەرخان کردووە لەگەڵ ئەمەیش - مارلین مۆنرۆ - دەبێتە ناونیشانی فلیمێك کە پەردە لە ڕووی چەندان نهێنی نوێ لە ژیانی - مارلین دا هەڵ دەداتەوە . . !!

شۆخی بەهرەمەندو بەتوانای



رغـــده

هونەری حەوتەمی - میسری - نجلاء فتحي لە میهرەجانی گەورەی شاری - مەڕاکیش - ی، مە غریبیدا بەشداری کرد ئەوەی ڕاستی بێت ئەم شارە یەکەمین خولی ئەم میهرەجانەی بەخۆیەوە بینیوەو [ ٢٠ ] وڵاتی گرنگیش بەشداری یان تێداکردووە لەکۆتاییش دا خەڵاتی - ئەتڵەسی- گەورەی وەکو - لقە زێرینی - میهرەجانی - کان - پێش کەش بە فلیمی سەرکەوتوو کرا . . !!



نجلاء فتحي

شۆخە ئەستیرە گەشەی - سووریایی - ڕەغدە دەمێکە لە وێنەکێشانی فلیمە (مصرع الذئاب)بووەتەوە کە لەگەڵ ( کرم مطاوع )و(احمد راتب)دەوری سەرەکی تێدا دەگێڕێت، فلیمەکەش چیرۆکی( طارق محرم)و دەرهێنانی - احمد صقره لەفلیمی ناوبراودا ئەکتەری - سووریایی - دەوری کارەکەر دەگێڕێت و خەون بەوەوە دەبینێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە خانمێکی گەورەی کۆمەڵ هەروەها ئێستاش ئامادەیی خۆی پیشان داوە کە دەوری سەرەکی لە فلیمی - نساء صعالیك -دا بنوێنێت .



مۆسیقا کاریکی هونەری گەلی بەنرخەو زۆر لەلای خەلکیش خۆشەویستە چونکە موسیقا وەك خوراکیکی گیانی وایەو میشکی مروڤ دەحەسینیتەوەو دلی مروڤیش شاد دەکات

ئەم گفتوگویەمان جا لیرەدا لەگەل لاویکی مۆسیقا ژەنا ساز کرد تاکو هونەر دوستانی میللەتەکەمان ئەم هونەرمەندە بناسن و ئاگاداری حەو جوول و چالاکی‌یەکانی بن کە لەم بوارەدا نواندویەتی.

# گفتو گۆیەك لەگەڵ هونەرمەندێکی مۆسیقا ژەندا...

کاك - ڕەوەز - دەمانەوێت کورتەیەك لە ژیانت باس بکەی...

+ من ناوم - ڕەوەز ئیسماعیل - ە - لە ساڵی ١٩٦٦ لە شاری - هەولێری - دێرین لەدایك بووم و دەرچووی ئامۆزگای پەیمانگای هونەرە جوانەکانی - (موصل) م - بەشی - مۆسیقا - و - لقی - کەمانجەم.

● سەرەتایی هونەریت چۆن دەستی پی‌کرد؟!

+ لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ دا چوومە ناو تیپی - مۆسیقای - منداڵان - کە مامۆستای هونەرمەند - وریا ئەحمەدا - سەرپەشتی دەکرد کە لەم تیپە خنجیلانەدا ئامێری - ئوکۆردیۆنم - دەژەند لە دوایی‌دا چوومە ریزی - تیپی هونەری هەولێر

● لەدوا پۆلی پەیمانگادا - ئوتروحەی - دەرچوونت لە پەیمانگادا بریتی بووە لە چی؟

+ ئوتروحەکەم بریتی بوو - لە دوو بەش - کە بەشی یەکەم بریتی بوو لە کاریکی مۆسیقایی هونەرمەندی بەناوبانگی جیهانی - باخ - کە بە ناوی - ڕیمی جەرباخ - بوو - بەشی دوهەمی ئوتروحەکە بریتی بوو لە پارچە مۆسیقایەکی کوردی کە لەسەر شیعری - شاعیری لاو- عبدالرحمن بێلاف - بوو.

● ئەی ئیستا خەریکی چین و چیتان لەبەر دەست دایە؟

+ ئیستا ئەندامم لە تیپی مۆسیقای میدیا - کە سەر بە ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوانە - هەر لەم تیپەش دا بەشداری ئەو کارە مۆسیقا یەم کرد کە لە کاسێتێك دا کە بەم دوایی‌یە بلاوبوەوە کە هەر دوو هونەرمەند - زیاد ئەسعەد و محمد عەزیز - بە گۆرانی بەشداریان کرد... هەروەها دانانی هەندێك ئاواز لەسەر شیعری شاعیر - عبدالرحمن بێلاف.

ئیستاش خەریکی هەندێ ئاوازم بۆ گۆرانی.

● وەك هونەرمەندێك بە چ گیروگرفتێکەوە دەناڵێنن؟

+ بەلای منەوە لە کاری مۆسیقاو گۆرانی‌دا هەبوونی ئەندازیاری دەنگ کاریکی گەلێك بەسوودو دەنگ وەکو کەلەبەریکە لە مۆسیقاو گۆرانی‌دا ئیمەش کە ئەم جۆرەمان نی‌یە بەلامەوە گیروگرفتە زۆریش ئارەزووم لەوەیە کە ئەم گیروگرفتەش لە ریگەی مۆسیقاو گۆرانی کوردی‌دا لابریت بۆ ئەوەی مۆسیقاو گۆرانی کوردی‌مان سەرکەوتوو بێت.

● ئەی گۆڤاری ڕەنگین؟

+ دەرچوونی گۆڤاری ڕەنگین بەم شێوە جوان و لەبارو قەشەنگە مایەی شادی‌و بەختەوەری هەموو لایەکمانە، چونکە زۆر پێویستە گۆڤارێکی ئاوا ڕێك وپێك لەناومان دا هەبێت.

● هەروەها زۆریش بەختەوەرم کە گرنگی‌یەکی تەواو بە هونەرو هونەرمەندان ئەدات و سەردانەکەشی بۆ ماڵی هونەرمەندان خۆی لە خۆی‌دا دیاردەیەکی دڵ خۆش کەرو بەتامە تاکو جەماوەر لە نزیکەوە ئاگاداری هونەرمەندەکانمان بین.

● دوا وتەت چی‌یە؟

+ هیوادارم هەردەم هونەری کوردی بەرەو پێشەوە بچێت و هیچ گیروگرفتێك نەبێتە هۆی ئەوەی کە هونەرەکەمان دوا بکەوێت، خۆشم هەردەم بە خزمەت گوزاری هونەرو مۆسیقای کوردی دادەنێم و هیوادارم هەردەم هونەرەکەمان ئاوا سەربکەوێ

ئامادەکردنی /
فاتیح شەیدا بەرزنجی



# هونەرمەند عەلی کەریم

## شانۆ وەك کردەیەك سەنعەت سازییە پێش ئەوەی بەهرە بێت!!



کاك عەلی کەریم یەکێکە لە هونەرمەندە ناسراوەکانی شاری کەرکووك و لە ساڵی ١٩٤٧دا لە شاری کەرکووك لەدایك بووە:

● بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٦٨ بەشداری شانۆیی «پارەی دەرمان»ی یوسف العانی کردووە

●لە تەلەفزیۆن دا سەرەکی لە (مەرەزە)و (بەهاری دزراو)و(ژاڵە)ی بینیوە.

لە شانۆش دا لەم بەرهەمانە کچەلاڵەکە)و «خاکەکەم »و«یەك ، دوو، سێ»و«تەقینەوە»و«کاتێ برینەکان ئەدوێن»و«توفانی بێدەنگی»و «دوورەگ» و «دکتۆر پاڵی»و «مانگی ئاوا بوو»و «سروودی خۆشنوودی» بەشداری کردووە.

● لەبواری نووسین دا ئەم شانۆیی‌یەی تاك ئەکتەرییانەی نووسیوە «گەمەی خۆشەویستی »و «ئەسپە سوورەکان» «یاداشتی سپی»و «دووا دەنگ

٥ـ لە ساڵی ١٩٧٤ خەڵاتی •باشترین زارڤەکەری ئەکتەری دراوەتێ.

٦ـ دەرچووی پەیمانگەی ئامادەکردنی مامۆستایانی کەرکووکە.

لەپاش میهرەجانی چووارەمی شانۆی کوردی لە سلێمانی و دووا بەدووای نمایش «سرودی خۆشنوودی»کە لە نواندنی«عەلی کەریم»ودەرهێنانی«جەلیل زەنگنە »بوو زۆر لە هونەرمەندو رەخنەگرە عەرەبەکانی شانۆی عیراقی پەنجەیان بۆ ئەوە راکێشا کە ئەکتەرێکی شانۆیی لێهاتووە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بەهۆی دەنگ و جەستەیەوە توانی خۆی بخاتە پێشەوەی ئەکتەرە هەڵکەوتووەکانی شانۆی عیراقی رەنگین خۆشحاڵە ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ دا ساز بدات:

*کاك عەلی با لایەك لە رابوردوو بکەینەوە.

ـ رابورد خوێنیەوە وەك ئەوە وایە هونراوە هەرەس هێنانی خودی خۆت بهۆنیتەوە.

ـ ئەگەر رابوردو نەبێ ئێستا بونیاد نانرێ.

ـ ئێستا ئێستایە، رابوردوش مردو، وا لە ئەرشیف دا هەڵگیراوە.

* کەواتە زەمەن بەلای تۆوە ئێستایە؟

ـ ئەو ساتە وەختەیە کە رووداوەکان لە شێوەی خەون دا تێدا روو دەدەن، جیوەیین، دەست گیرنابن، هەرکە دەست گیریش بوون و لە چوار چێوەی مانادراوە بێ‌گومان مەبەستم مانای یەك مەودایە، ئەوسا بۆ ئەرشیف چاکەو تەنها رۆحی رووداوەکە نەبێ کە لە پانتاییەکان دا بە شێوەی بچڕبچڕ ماوەتەوە.

* وەك بەهرەوەرێك؟!

ـ ئەگەر چی قسەکەت پێ ئەبڕم، شتێك نی‌یە ناوی بەهرە بێ هەموو کردەیەکی هونەری یان ئەدەبی پەیوەستە بە سەنعەتکارییەوە، یانی شارەزابوون.

*بەڵام کرداری هونەری چ شانۆیی ،یان مۆسیقا، یان وێنەکێشان بوارێکن بۆ کردەی داهێنان، داهێنانیش لە بەهرەو شارەزا بوونەوە دێتەدی.

ـ راستە بەڵام کام داهێنان؟ ئەزمونە هونەرییەکانی ئەم دوایە دنیا پێ‌لەسەر ئەوە دادەگرن کە هونەر لە زانستەوە نزیکە، ئەوەتا فیزیاو کیمیاو دوا زانستی نزیك بە شانۆن. شانۆ وەك کردەیەك لە بواری داهێنان دا بەلای منەوە سەنعەت سازییە پێش ئەوەی بەهرە بێت.

*بەلای تۆوە نواندن چی دەگەیەنێ؟

ـ خەونێکەو بە کۆتایی نمایشەکە کۆتای پێ‌دێ، ئەوسا دەبێتە بیرەوەرییەك بە حاڵ وەیاد دەکەوێتەوە.

*ئەی ئەکتەر(زارڤەکەر)؟

ـ گوێ‌رایەڵی ئەو شوێنەیە کە تیایدا دەجووڵێتەوە.

*ئەمرۆێ شانۆی کوردی؟

ـ لقێکە لە رۆشنبیری نەتەوەییمان، کردەیەکی شارستانی‌یە، پێویستیەکانی بوون، لە ئەنجامی وتووێژکردن لەتەك رۆشنبیری گەلانی دی دامەزراوە، بەبێ ئەم وتووێژکردنەش ئەم کردەیە لە شێوەی ئەفراندن بونیاد نانرێ

*ئەی پرۆژەی دامەزراندن لە شانۆی کوردی‌دا؟

ـ یەك لە بۆچونە سەرەکی‌یەکانی شانۆیی کردەی دامەزراندنە، دامەزراندنیش کردەیەکی کۆمەکی‌یە هەروەکو ئەوەی کردەیەکی شارستانی‌بێ، هەمە توخمە شانۆیی‌یەکان بەشداری وەبەرهەم هێنانی دەکەن هەر لە دەقەکە تا سازدانی نمایشەکە لە سەر تەختە شانۆکە، تا دەگاتە بەشداری‌کردنی بینەر لە مەسەلەی سەلماندنی بوونی ئیجابی خودی وەك کارمەندێك ، چونکە مێژوو رووداوەکانی بەبێ هۆشی مێژوویی نەدروست دەبن و نە دەکەونە جووڵە. چونکە ئەم هۆشە مێژووییە هەموومان دەخاتەگەر.

ئامادە کردنی

محمد عبدالرحمن زەنگنە

# دیاری رەنگین



هونەرمەندی کورد
مامۆستا بەدیعە دارتاش



# یادی ماستاوێك

هەوارێكی كوردستانە
نەگەرمەسێر نە كوێستانە
سەرچناری سولەیمانی
شاری هەڵمەت و قوربانی
چونكە سەرەتای هاوینە
هەتاوی تۆزێ بەتینە
قرچەی گەرمای نیمەڕۆیە

• كزیی جووڵەو هاتوچۆیە
منیش تینوو گێژو مانوو
ئەگەرام خانوو بە خانوو
دەرگای دیاری، خۆی بووچابوو
كەماڵی بابی سارا بوو [1]
خێراتنێ گەرم كرا
ئەمجا ماستاوێك دانرا
جامێ گەورەی ماستاوی چاك
شێوە كوردی پاكی دەسپاك
تۆزێ جوولاّ هەست و هۆشم
بزوانی یادی خامۆشم
یادی گەرمی ژینی جاران
ئالوودەیی گرۆی یاران

## مەشكە

یادی بەهاری ئێلاخان
شەقەی مەشكەی ناوی باخان
لە خاڵمدا
لەناو شاشەی خەیاڵمدا
شێوەی مەشكەو مەشكەژەندن
ئەو بەشانەی پێوە بەندن
سێپاو گوریسی هەڵخستن
بەنی بە یەكترۆ بەستن [2]
یەك دوو داری پێوە هەیە
یەكێ درێژ دۆژەنكەیە
دوانی تریان خڕو كورتن
واتە جووتێ دەسەخورتن
لەهەنگڵد بەردێ هەیە
یاوەك تەرامی نەیجەیە [3]
بەنی هەنگڵ بەنێكی تر
دەرگاوێنە [1] بەنی دەمگر
ئەگەر مەشكە كونی تیابێ
ئەبێ بە پشك گیرابێ

* *

شریتی یادم والێدا

ماستاویش هەروا لە جێدا
لادێیی بووم لادێ ئاسا
گوێم نەدایە هەندێ یاسا
تۆزێ سینەم بردە بەرۆ
ماستاوەكەم نا بە سەرۆ

پەراوێز:

(١) بابی سارا: ئەندازیار كاك موحەممەدی كوری دكتۆر موستەفا زەڵمییە

(٢) مەبەست بەنێكە كە داری سێپا كانی پێ ئەبەسترێ بە یەكەوە پێش ئەوەی گوریسی لێ ببەسترێ جاری واهەیە بەتەل داری سێپا كان ئەبەسرێن بەیەكەوە كە كونیان تێكراوە بۆ ئەو مەبەستە.

(٣) لەناو هەنگڵی مەشكەدا بەردێك دائەنرێ بۆ ئەوەی بەنی پێوە ببەسرێ بەدەسە خورتەوە

[illegible]

پارچەیەك نەیجە دائەنرێ كە پێی ئەوترێ تەرامەنەیجە. بەم پێیە مەشكە پێك دێ لەم بەشانەی خوارەوە:

١- پێستی مەشكە، ٢- سێپا: سێداری درێژە مەشكەكەی لێ هەڵئەخرێ.

٣- گوریس، گوریسێكی درێژە لەسەرەوە بەسراوە بەسەری (٣) داری سێپاوە لە خواریشەوە بەستراوە بە چرار هەنگڵی مەشكەكەوە.

٤- دەسەخورت یان دەسەخورد، ئەخورتیشی پێ ئەڵێن: دووداری كورتن بەشێوەیەكی تایبەتی تاشراون، یەكێكیان دوو هەنگڵی پێشەوەی پێوە بەسراوە ئەوەكەی تریان دوو هەنگڵی دواوە، هەریەكە لەناوەڕاستا كونێكی درێژی تیایە.

٥- دۆژەنكە، دارێكی درێژە، هەردوو سەری تاشراوەسەرێكیان ئەكرێ بە كونی دەسە خورتی پێشەوەدا ئەو سەرەكەی تر بە كونی دەسەخورتی دواوەدا.

٦- بەردی هەنگڵ یان تەرامی نەیجەی ناو هەنگڵ.

٧- بەنی هەنگڵ چوار پارچە بەنن كە هەر چوارهەنگڵەكە ئەبەستن بە سەری دەسە خورتەكانەوە.

٨- بەن یاتەلی داری سێپا بە یەكەوە بەستن پێش گوریس لێ بەستن

٩- دەرگاوێن: بەنێكی قایمە دەمی مەشكەی پێ ئەبەسرێ

١٠- پشك بەو چوكلە یان پارچە دارە ئەڵێن كە پێوە ئەبەسرێ و ئەخرێتە كونی مەشكەوە بۆ ئەوە دوێ لێ [illegible]

١١- جاری واهەیە بەبەنێك سەری دۆژەنكە ئەبەسرێ بەدەسە خورتەوە كە دوو پارچە بەنە بۆ هەردوو سەری دۆژەنكە.

سەرنج: جارێك لە رۆژنامەیەكی كوردیدا بەرچاوم كەوت وابزانم (هاوكاری) بوو كە باسی مەشكە كرابوو. نوسرابوو لە (٨) پارچە پێك هاتووە كێ ئەیزانێ بۆمان بنووسێ بەو پێیە رەنگە هەموو بەنەكانی بە بەشێك داتابێ.

سەرتەك جاف

# جۆن کیتس و فاننی دەزگیرانی

کەریم مستەفا شارەزا

جۆن کیتس (١٧٩٥ ـ ١٨٢١) گەورەترین شاعیری بلیمەتی ڕێبازی ڕۆمانسی شیعری ئینگلیزی بوو. لە سەرەتادا کەوتە سەر خوێندنی نۆشداریی، بەڵام لە دوایی‌دا لە ئەدەب گیرسایەوە.

لە شیعری ناسك دانان دا زۆر هونەرمەندبوو، ئەمە وای لە ڕەخنەگران کرد بڵێن هۆنراوەکانی کیتس نموونەی بلیمەتی‌ی سەدەی نۆزدەهەم دەنوێنن و، لە شیعر هۆنینەوەدا ئەدەب و ئەفسانەی سەدەکانی ناوەڕاست و کەلەپووری گریکی بەکاردەهێنا. بەم کارەیشی جۆرە پتەوی‌و قووڵی‌یەکی بە هۆنراوەکانی دەداو بەرزترین داهێنانی لە هۆنراوە کورتەکانی وەکو [بۆ پایز] و [بۆ بولبول] دا دەرکەوت.

لە ساڵی ١٨١٨ دا تووشی نەخۆشیی (سیل) بوو، هەر لەو ساڵەدا حەزی لە کچێکی زۆر جوان و شۆخ کرد، ناوی [فانی براون: Fanny brawne] بوو، تەمەنی دەگەیشتە ١٨ ساڵ و نموونەی نازداریی بوو.

دۆستە نزیکەکانی دەیان گوت: «لەوانەیە ئەو کچە بتوانێ شیفای ئەو دەردە کوشندەیەی پێبدات کە لەمەوبەر نۆشدارەکان نەیان توانیوە پێی ببەخشن! بەڵام کاتێك کە (شیللی) شاعیری ناوداری شیعری ڕۆمانسی ئینگلیزی لە دوای چەند ڕۆژێك لەو حەزو خۆشەویستی‌یەیان وەك دۆستێکی نزیك و دڵسۆز سەردانی‌کرد، بینی دڵی ناسکی (کیتس) ی ئاشقی دەردەدار پتر تواوەتەوەو باری تەندروستی زیاتر تێك چووە!!

شیللی لێی‌پرسی: «بۆچی وات لێهاتووە؟» لە وەڵام دا کیتس گوتی: «خۆشەویستی‌و جوانی‌ی (فاننی) پتر ئازارم دەدات! من دەم ویست تەنیا بۆ من بێ‌و لە من زیاتر کەس نەی‌بینێ‌و لە گەڵی‌دا نەدوێ! دەم ویست لە ماڵێکی لە مەڕمەڕ دروست کراوی دابنێم و تەنیا من و ئەوی تێدا بژی‌و بەس!! کەچی ئێستا من وام لێهاتووە، تەنانەت گومان لە شنەی بایش بکەم، نەك لێی‌بدات و بەشداریی لە حەزو خۆشەویستیم بۆ فانتی بکات!!».

فاننی دوای ئەو باری تەندروستی تێك چوونەی کیتس پێی‌گوت: «دۆستی خۆشەویستم تۆ ئێستا چیت لە من دەوێ تا بیکەم؟!» کیتس لەوەڵام دا گوتی: «دەمەوێ شەوو ڕۆژ لەلام دابنیشی تاکو تێر بەم چاوانەم سەیری جوانی‌و ناسکیت بکەم!!»

فاننی کە ئەمەی لێ بیست، خۆی‌و دایکی هاتن خانوویکی بچکۆلەیان لە تەنیشت ماڵە خنجیلانەکەی کیتس دا بەکرێ‌گرت و دوای چەند هەفتەیەك کیتس داخوازی کردو، (فاننی) یش پەنجەرەکەی نێوان ماڵەکانیان شەوو ڕۆژ لەسەر پشت دەکردەوەو تەنانەت ئەگەر ساردیش بوایە دای‌نەدەخست و هەردووکیان بەرانبەر یەکتری دەوەستان و ڕازی تەنیایی خۆیان بە گوێی یەکتری‌دا دەچرپاندو نەیان دەتوانی لەیەکتری جودابینەوە!!



کیتس لە هۆنراوەیەکی‌دا بەم جۆرە لە (فاننی براون) ی دەزگیرانی دواوەو گوتوویە: «زۆر جوان بوو... خۆشم دەویست چونکە لە ژیان جوانترو خۆشەویستر بوو! لارو لەنجەی ئاوازێك بوو، کە دەرۆیشت وام هەست دەکرد هەموو پیاوانی جیهان بۆ سەماکردن بانگ دەکات!!

دەنگی سروودو گۆرانی‌یەکی خۆش و نەمر بوو! پێکەنینی ئاگرێك بوو سنگی دەسووتاندم و کاتێ کە پێ‌دەکەنی وام دەزانی هەموو شتێك بۆی پێ‌دەکەنی!!»

لە زستانی ساڵی ١٨٢١ دا لە سەر ڕاسپاردەی نۆشدارەکەی چووە ئیتالیا تاکو لە شاری (ناپۆلی) لە ژێر تیشکی گەرمی ڕۆژدا ئەو زستانە بژی‌و هەوا گۆڕی بکات و دوای ماوەیەکی کەم بگەڕێتەوە باوەشی (فاننی) ی دەزگیرانی‌و بیگوازێتەوەو، لە هەموو نامەیەکی‌دا بە گوێی‌دا دەچرپاند [کە بەم زووانە دەگەڕێمەوەو چاوەڕوانم بە!!]

کیتس لە ماوەی ئەو یەك دوو مانگەی کە لە ناپۆلی بوو گەلێك هۆنراوەی نوێی لە سەر خۆشەویستی فاننی‌و ئێش و ئازارەکانی دڵی خۆی دانا، لە

یەکێك لەهۆنراوەکانی‌دا دەڵێ:
«ئەگەر لەم دەردە ڕاست ببمەوە، هەرچی لە دەستم بێ بۆ خۆشەویستەکەمی دەکەم! خۆشترین ژیانی بۆ دەرەخسێنم. بە هێمن و دڵنیایی لە باوەشی‌دا دەخەوم! ئەگەر مردیشم هیوادارم هەموو لایەك لێم خۆش بن!!»

کیتس نەیتوانی چی تر خۆی لەبەر ئەو دەردەی وەرەمە ڕابگری‌و کاتێك کە گیانی پاکی دەسپارد، (شیللی) ی شاعیری دۆستی لە پشت سەری بوو و

کیتس لە تەمەنی ٢٦ ساڵی‌دا لە ڕۆژی ٢٣ ی شوباتی ١٨٢١ دا گیانی سپارد و لە گۆڕستانی ئینگلیزەکان لە شاری ڕۆمای ئیتالیادا نێژراو: (شیللی) بەم جۆرە لە کارەساتی (کیتس) ی دۆستی‌یەوە لە داستانێکی شیعری‌دا دواوەو دەڵێ: «دەرد ئازاری‌دا، بەڵام ئازاری دڵی گەورەتر بوو!! خۆزگە ئەو کچەی نەناسی‌باو خۆشی‌نەویست با، چونکە ئەو حەزو خۆشەویستی‌یەی بۆ (فانی) پەلەی لە مردنی کردا!!»

•

سەرچاوەکان:

١ ـ مجلة العربي ـ العدد ١٣٩ حزيران ١٩٧٠.
٢ ـ الموسوعة العربية الميسرة ـ القاهرة ١٩٧٢، ص ١٥٢٥ ط ٢.
٣ ـ سمير شيخاني ـ مع الخالدين ـ بيروت ١٩٥٩، ص ١٦٨، ١٦٩.

# لەگەڵ نووسەرە ناودارەکانی جیهان دا



هەمە نگوای



تولستۆی

١ ـ کە (ئەبراهام لنکولن) کرا بەسەرۆك کۆماری ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێ‌کرا بۆ پیرۆزبایی لێکردنی ئەویش بەم وشانە وەڵامی دانەوە: «پیرۆزبایی لە من مەکەن، بەڵکو پیرۆزبایی لە دایکم بکەن چونکە ئەو بووە بەمایەی بەرزکردنەوەو گەیشتنم بەو پلەو پایەیەی ئێستا».

٢ ـ دەگێڕنەوە کەوا (ئەلفرید هیچکوك) زۆر خۆر بووەو دەڵێن لە ئاهەنگێك دا کە بۆ خواردنی ئێوارە بانگ کرابوو، ئەو خواردنەی بۆی دانرابوو زۆر کەم بوو پێی تێرنەبوو، لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا (هیچکوك) چووە دەرەوەو خاوەن داوەتیش لەدواوەی دەرویشت بۆ بەڕێ‌کردنی. لەبەر دەرگا لە کاتی خواحافیزی‌دا کابرا بە (هیچکوك) ی گوت ـ نومێدەوارین بە سەردانێکی‌تر گەورەمان بکەنەوەو خواردنیش لای ئیمە بخۆن، (هیچکوك) یش یەکسەر گوتی: دەباشە بۆ ئێستا دەست پێ‌نەکەینەوە:

٣ ـ ڕۆژنامەنووسێك پرسیاری (حەز دەکەی چی لەسەر کێلی گۆڕەکەت بنووسن) ی لەبەردەم چەند ئەدیب و هونەرمەندێك دانا بۆ ئەوەی ڕای خۆیان لەسەر بدەن:
ـ (ماریا کالاس) وەڵامی ئەمەبوو: (لە کۆتایی‌دا گەیشتمە ئەوسەری ڕێگا).

ـ (چارلی چاپلن) ی هونەرمەندیش گوتی (لێم ببورن ئەگەر نەم توانی لەبەرتان هەڵسم و سڵاوتان لێ‌بکەم).

(هەمەنگوای) ڕۆمان نووسیش گوتی: (ئالێرەدا هەمەنگوای خەوتوە، لەسەر ئەو خاکەی کە هەرگیز حەزی لێ‌نەدەکرد.)

٤ ـ مەکسیم گورگی دەڵێ: هەرکە بیر لەوە دەکەمەوە کەوا مرۆڤ لە کاتی تەنیایی دا چۆن ڕەفتار دەکات یەکسەر دەگەمە ئەو ئەنجامەی کەوا لەشێتێك زیرەتر نی‌یە، ناتوانم وشەیەکی لەمە چاتر بدۆزمەوە.

یەکەمین جار کە ئەم هزرەم هاتەمێشك منداڵ بووم، قەشەیەك کە ناوی (روندال) بوو لە ساڵۆنیکی چۆڵ وهۆڵ دەهات و دەچوو، هەرکە دەگەیشتە بەرامبەر ئاوێنەی ساڵۆنەکە یەکسەر کڵاوەکەی لەسەر دەکردەوەو لەبەردەم ئاوێنەکە دەچەمایەوەو مەزنە سڵاوێکی دەساندەوە!

٥ ـ ڕۆژێکیان (لیون تولستوی) لەسەرەخۆ بە مارمێلکەیەکی گوت کە لەسەر بەردێکا ڕاکشابووو خۆی گەرم دەکردەوە: (چۆنی؟ باشی؟) پاشان هێدی هێدی دەستی خۆی درێژکردو بەو پەڕی ئاگاداری‌یەوە تەماشای هەموو لایەکانی مارمێلکەکەی کرد هەروەکو بیەوێ شتێکی گرنگی بە گوێ‌دا بچرپێنێ خۆی خوارکردەوەو گوتی: (ئەگەر لە من دەپرسی ئەوا هیچ باش نیم!)

٦ ـ پرۆفیسۆر (تیخونکی) کیمیازانی ناسراو لە ژووری نان خواردنی خۆی دانیشتبوو ڕووی لە وێنەی خۆی کرد کە لەنێو سینی نان خواردن دیاربوو پێ گوت: (هاوڕێ چۆنی؟) کە هیچ وەڵامی لێ‌نەبیستەوە هەناسەیەکی هەڵکێشاو هەوڵی‌دا بە دەستی وێنەکەی خۆی لەسەر سینی‌یەکە بسڕێتەوە.

٧ ـ دەڵێن ڕۆژێکیان (پیکوف) یان کە لە تەك مێزێك ڕاوەستابوو هەندێ پەمووی بو ئاسمان هەڵدابوو بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو ئەو دەفرەی کە دایناببوو، پاشان خوی خوارکردبووەوە گوێی خۆی هەڵ خستبوو بۆ ئەوەی گوێی لە دەنگی کەوتنی پەموکەبێ!

٨ ـ ولادیمسکی قەشە ڕۆژێکیان جووتە پێڵاوەکەی لەبەردەمی خۆی دانابوو حوکمی لێ‌دەکرد بڕوا، کە بینی پێڵاوەکانی ناجوڵێنەوە لێی‌پرسی: چی‌یە ناتوانی بەڕێ‌دا بڕۆی؟ دەباش بزانە تۆ بەبێ من ناتوانی لە جێی خۆت بجوڵێیەوە!

ئامادەکردنی
● کەریم سۆفی ●

سەرچاوەکان:

١ ـ گۆڤاری کاروان ـ ژمارە ١/ تشرینی‌یەکەم/١٩٨٢
٢ ـ گۆڤاری الفنون/ ژمارە ٢٠٣ دووشەمە ٥/١٢/١٩٨٢
٣ ـ گۆڤاری حراس الوطن/ ژمارە ٧/ تەموزی ١٩٧٩






# ئەمرەكانی سینەما

چەنـد ساڵێـك لەمـەوبـەر، رۆژنامەی (هەفتەنامەی) (سەندەی تایمسی) لەنـدەنی توێـژینەوەیەكی دەربارەی ئەو هونەرمەندانە ساز كرد كە بە ئەنجامی چالاكیو ڕۆڵی پڕ بە تواناو ناسراوی خۆیـان ناویان لە مێـژووی سینـەمادا تۆمـار كراو گەیشتنە پلەی نەمران . بەگوێرەی بۆچـوونی پسپۆرەكـانی سەنـدەی تایمس و، هەر وەكـو وێنـەكـان روونی دەكـەنـەوە ئەم نەمـرانـە (٤٢)كەس بوون و، وا، ناوەكـانیـان بە پێی ژمـارەی سەر وێنەكانیان دەنوسین:

•

بێگـومان دوور نی‌یە هەندێ لە خوێنـەرانی (ڕەنگـین شارەزاییـان لەگـەڵ چەشن و چۆنیەتی چالاكی (ئـەكتەر دەرهێنە. . . هتد زۆربەی ئەم هونـەرمـەندانەدا نەبێت لە بەر ئەوە، لە دەرفەتێكی دیكەدا، هەوڵ دەدەین هەندێكیان روون بكەینەوە.

ئامادەكردنی:

انور محمد قرەداغی

# گەشتێک بەناو بەشەکانی نەخۆشخانەی نەخۆشییەکانی دڵ

نەخۆشخانەی ابن النفیس بۆ نەخۆشی دڵ و ریشاڵەکانی خوێن (الاوعیة الدمویة) لە بەغدا گەورەترین نەخۆشخانەیە لە عیراق داو چەند بەشی تێدایە کەوا بە نوێترین ئامێرو سیستەمی چارەسەرکردنی دڵ ئامادەکراوە بۆ ئەوەی رۆشناییەک بخەینە سەر دوو بەشی (القسطرة والىلاقسطرة) ی دڵ کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی دڵ.

لەبەشی (اللاقسطرة) و رەنگ کردنی خوێن بەرەکان چاومان بە لێپرسراوی بەشەکە نۆشدار بەرێز کامل ئامق کەوت لەم بارەیەوە وتی.

لەم بەشە ئامێری (الایکو) - ECHO بەکاردەهێنین کە شەپۆلی ژوور دەنگە - (الامواج فوق الصوتیة) ی ئاراستەی دڵ دەکات و دەنگدانەوەی لەسەر پەردە (شاشە) یەکی تەلەفزیۆنی تایبەت وەردەگرێت و وێنەی دڵی نەخۆشەکە دەگرێت.

● چ نەخۆشییەکی دڵ بەم ئامێرە فەحس دەکرێت..؟

نەخۆشی فراوان بوونی (صمام = دەرچە)ی دڵ، ئەمەش دوو جۆر نەخۆشی دەگرێتەوە زگماکی واتە هەر لە منداڵ بوونەوە تووش دەبێت...

دووەم: وەرگیراو (مكتسبه) بە هۆی باداریو تای رۆماتیزمی کە بە هۆی هەوکردنی دوو بادەمی تیژ (الحاد) روودەدات. لەهەندێ حاڵەت دا دەبێتە هۆی تای رۆماتیزمی ئەگەر بە شێوەیێکی چاك چارەسەر نەکرا، کاردەکاتە سەر (صمامەکانی) دڵ و دەبێتە هۆی فراوان بوون یا تەنگ بوونی ئەو صمامانە، دەبینین دەچێتە دڵ بەڵام بەکەمی، ئەم حاڵەتەش بە جیهازی (ایکو) فەحس دەکرێت..

هەروەها ئەو نەخۆشەی دڵە کوتکێی هەیە (خفقان) واتە لێدانی دڵی ئاسایی نییە یا زیاد لێ دەدات یاخود لێدانەکانی رێك نییە، بۆیە نەخۆشەکە هەست بە هیلاکیو ماندووبوون دەکات، تەنانەت ئەگەر دانیشتبێتیش و هیچ نەجوڵابێتیشەوە..



## ئەو پەڕی هەوڵ دەدرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی دڵ

له ژوورەکـە ئامـێرێکـی ترم بەرچاو کەوت، وتی ئەوە (HOLTER) هۆڵـترە، ئەو نەخـۆشـەی تووشی نەخۆش دڵ بووە بە ئامێری (تخطيط القلب = هێڵکـاری دڵ) تخطيطی دڵی بۆ دەکرێت، ئەگەر حاڵەتەکە تەشخيص نەکرا ئەوە ئامێری هۆڵتر (HOLTer) بەکـاردەهێنـرێت کەوا بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر (تخطيطی) دڵ دەکـات و بریتی‌یە لە تۆمارگەیەکی بچووك، نەخـۆشـەکـە بە ئاسانی هەڵی‌دەگـرێـت و لەگـەڵ خۆی دەیبـاتەوە ماڵەوە، بەم جۆرە شەوو رۆژ لێدانی دڵ تۆماردەکات . .

رووبان کردە بەشێکی‌تر ئەویش (الـقـسـطرة) و رەنـگ کردنی خوێـن بەرەکـانـە چاومـان بە لێبرسراوی بەشەکە، نۆشدار محمد الغبان کەوت کە باسی کورتەیەکی بەشـەکـەی بۆ کردین و واتـای (قـسـطرە) ی دڵ چـی دەگەیەنێ . . ؟

(قسطرە) عەمەلیاتی تشخيصيە



بۆ نەخۆشی‌یەکانی دڵ چ زگماکی‌و چ وەرگیراو . . . زگماکی بۆ نموونە تەشخيص کردنی (فتحـە) کانی هەروەهـا نەخـۆشـی‌یـەکـانی زگـماکی‌یـەکـان (الازرقـاقيه) وەکو چوارگـۆشـەیـی فالـوت و رەنگدانەوەی خوێن بەرەکانی‌دڵ .

بەڵام نەخۆشی‌یە وەرگیراوەکان وەکـو فراوان بوون و تەنگ بوونی (صمامەکـانی) دڵ و سنگەگۆشێ (الذبحة الصدرية) وجلطەی دڵ هەروەهـا رەنـگ کردنـی ئەو خوێـن بەرانـەی دەوروبـەری هەردووقـاچ و دەستن، ئەمـەش لەرێگەی خوێن بەروخوێن هێنەر لە دەسـت یا قاچ لە رێـگـەی بەکـارهێنـانی قسطور (Catheter) دەبێت، ئەم قسطورە دەخرێتە دڵ یا خوێن بەرەکـان پاشـان بەشێـك لەخـوێنـەکـە وەردەگـرێـت و کەرەسـتەیـەکی تێ‌دەکـرێت بۆ رەنگکردنی دڵ و خوێن بەرەکان، ئەم کەرەستەیەش (یۆروگرافین) ی پێ‌دەڵێن . . .

● تا ئێستا چەند نەشتەرگەری (قسطرە) تان لەم بابەتە کردووە . . . ؟

لەم چەنـد ساڵـەی دواییـەدا (٩٠٠٠) نەشـتـەرگـەری (قسطرە) مان کردووە کە پیاو وژن و منداڵانی گرتۆتەوە .

● ئایا هیچ پێشکەوتنێکی نوێ لەم عەمەلیاتا نەرووی‌داوە . . ؟

لەم دوایی‌یەداو بۆ یەکەمین جار لە وڵات دا (صـمام = دەرچـە) ی سێی زگماکی‌کـراوەتەوە، هەروەها تەنـگ کردنی شادەمـاری سنگ بەهـۆی بالـۆنێـك و بەبێ هیچ نەشتـەرگـەرییـەك کە پێشـتر



# لەم چەند ساڵەی دواییەدا «٩٠٠٠» نەشتەرگەری قسطرەی دڵمان کردووە

نەشتـەرگـەریـان دەکـرد بۆ نەخۆشەکەو بەنجی گشتی لێ‌دەدراو عەمـەلیاتەکە چوار کاتژمێری دەخایاندو بۆ ماوەی بیست رۆژ لە نەخـۆشخـانـە دەمـایەوە . . . بەڵام ئێستا ئەم عەمەلیاتە بە هۆی بالۆنێك کە دەخـرێتە دڵـەوە، بالـۆنـەکـە فووی‌تێ‌دەکرێ بەهۆی کەرەستەی یۆروگـرافـین، بەم جۆرە (دەرچەی) ی یاخوێن بەرەکە بە بێ عەمـەلیـات دەکـرێتـەوە تەنها بەنـج کردنـی ئەو شوێـنـە . . نەخـۆشـەکـەش لە رۆژی دووەمدا دەتـوانێ دەربـچێت . . پاشـان نۆشدار محمد بە ئامێری (عارضە) فلیـمێکـی پیشـان دایـن چۆن عەمەلیاتی‌دڵ بە (قسطرە) دەکرێت بەڵام بەداخـەوە نەمـانتـوانی لەبەر هەندێ هۆی هونەری وێنەی‌بگرین .

● پەیـوەنـدی بەشی (قسطرە) بە (الـلاقـسـطرە) چی‌یـە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی‌یەکانی دڵ . . . ؟

کاتێـك نەخـۆشێـك دێ گومانی هەیە لە نەخۆشی دڵ (تخطيط) و وێنـەی شوعـاعی بۆ وەردەگـیرێت ئەگـەر (فتحـە) دڵی‌زگـماکی هەبوو دەینـێـریـن بۆ بەشـی ایـکـو ؟الـلاقـسـطرة) هەروەها ئەگـەر سنگەگـوشێ بووو، حاڵـەتـەکـەی تەشخيص کرا لەوێ رەوانەی بەشی (قـسـطرە) دەکـرێت بۆ ئەوەی گەورەیی (فتحـە) کە یا قەوارەی (فـتـحـە) کە یا چـەنـدی فراوان بوون و تەسـك بوونـی خوێن بەرەکـان بزانـرێت‌و هیـچ عەمـەلیاتێك ناکرێت بۆ دڵ ئەگەر ئەو نەخـۆشـە نەشـتـەرگـەری (قسطرە) ی بۆ نەکرێت .

سميرة محمد علي



# ساتێ لەگەڵ سنعەت کارێکی میللی کوردا

هەردەوێل کاکەیی

ئەم هونەرمەندە ناوی محەمەد کوڕی سەیید بارام کوڕی سەیید مستەفای کاکەیی یە لە ساڵی ١٩٥٢ی ز. دا لە خێزانێکی پیشەسازی میللی (دارتاشی)دا لە شاری کەرکەووك هاتوەتە جیهان. ئیستا دوکانیکی خنجیلانەی لە شاری کەرکووك هەیەو بەدرێژایی رۆژگار خەریکەو کار دەکات.

کارەکانشی پاك و پوختەن. ئەم پیشە بەنرخەی لەباو باپیرانەوە بۆ ماوەتەوەو وەچە لەپاش وەچە فێری بوون و دەستیان ێ هەڵ نەگرتووە.

کاك محەمەد. فولکلۆر دۆستە. مرۆڤێکی بە ئاین و رووناك بیرو چاوتێرە.

کارەکانی بەتیکرایی بە چەشنی فولکلۆری دەستکرد دەژمێررێن ئەم شتانەشی زووتر لەتەك باوکیدا دروست دەکرد:

١ـ سەنووق. ئەم جورە سەنووقە لە جیاتی بوفیەی ئەمرۆ لە شارو گندەکان بەکاردەهێنرا. پیخەفیان دەختەسەرو بوخچەشیان دەختە ناوی. هەرچی پارەو پوولیشیان هەبوو لەناویدا دایاندەنا.

٢. سەنوقچە (سەنووقی بچووك). ئەم سەنووقە گەلێ شتیان تێدا پاراستووە. لەوانە: کتێب و دەفتەرو قەڵەمی فەقێ ومەلاو قوریو پیالە. ژنانیش کلو دەرمان و گوڵاوو خشڵ و خەنەو ئاوێنەو تاراو هەر وردەواڵەیەکی تایبەتی خۆیان. ئەم سەنوقچەیە لە زور جیگا پێی ئەلێن (ئەشتەرخان)

٣. جەنجەڕ، ئامێرێکە لە دارو بسماری ئاسن و داری لوولە دروست دەکرا، جوتیارەکان بۆ کوتاندنی قرچە خەرمانیان پێ دەکوتا. ئیستا بەهۆی دەرچوونی ئامێری دەغل کوتانەوە( دەراسەوە) ئەم ئامێرە فولکلۆریە باوی نەماوە.

٤. هەوجار، لەداریبەروو یان توو دروست دەکرا. جوتیارەکان زەوییان پێ دەکێڵا. ئیستا باوی نەماوە.

٥. شەغرە، ئەم ئامێرە سادەیە جوتیارەکان بو گواستنەوەی قرچە لە پەریزەوە بۆ خەرمان بەکاریان هێناوە نیستا ئەمیش باوی نەماوە.

٦. قزناغ و نیوەقزناغ، جۆرە ئامێریکن بۆ پێوانی گەنم و جو بەکاردەهێنرێن.

٧. شەقل، لە شێوەی ماڵنج دروست دەکرا، بنەکەیان هەڵ دەکوڵاو لە چەشنی (مۆر)بو مۆرکردنی جێز بەکاریان هێناوە بۆ ئەوەی کەس دەستکاری ئەو جێزە نەکات.

٨. کلکەبێل و پاچ و خاکەنازو لاویتە.

٩. مشتکی داس و چەنگەل (قەرانگ)و داسولکە)و چەقۆ.

١٠. شەنەدارو پەرلۆ.

١١. لانك (بێشکە)، جۆلانە.

١٢. لانك و جۆلانەی بچووك بۆ

بووکە شووشەی منداڵان.

١٣. چەکوشی دارو میکوت و مێخ و شەکردان.

١٤. دیبەگ، بۆ کوتانی دانەوێڵەو ساوەر بەکاردێ.

١٥. تەتەشۆرو دارەتەرم (تابووت).

١٦. تەخت و مێزو تەختە (سەبوورە)

١٧. لەم ئاخرو ئۆخرەدا ئەم شتانەشیان دروست دەکرد. بۆفیە، دۆلاب، قەنەفە، کتێبخانە-هتد.ئەو شتانەی ئێستا دروستیان دەکات و لە دوکانەکەیدا دەیفرۆشێ و خۆی و خێزانەکەی پێی دەژین ئەمانەن:-

(١)لانك (بێشکە)جۆلانە

(٢) لانك و جۆلانەی منداڵانە کەوا بو بووکە شووشەو یاری منداڵان بەکاردێ.

(٣) ڕەورەوەی منداڵان.

(٤) کۆتر، تەق تەقەشی پێ‌دەڵێن، بۆ یاری منداڵان بەکاردێ.

(٥)دەرخۆنەو تەختەی گەرماوو کلکەبێل و خاکەنازو قازمەو کلکەتەورو گەلێ وردە ئیشی تریش. شایانی باسە کاك محەمەد هەرچەندە بەدرێژایی ڕۆژ لە دوکاندایەو کار دەکات بەلام کورێکی گورج و گۆڵەو ماندوو بوون و شەکەتی نازانێ چیە، بۆیە بەشەوانیش خەریکی شیعر نووسین و خوێندنەوەی جۆرەها کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەیە.

کۆمەڵێ هەلبەستی هەمەجۆری داناوە، بەرهەمەکانی بە زۆری ئاینی و نیشتمانی و ئامۆژگارین جگە لە زمانەکەی خۆی تورکیش بە چاکی دەزانێ و هەلبەستیشی بەو زمانە داناوە. ئەمەش چەند هەلبژاردەیەکە لە هەڵبەستە کوردیەکانی:-





-١-

من دارتاشێکم کوردێکی هەژار
خەریکی کارم بەیان تا ئێوار
بۆ خزمەت کردن کوردستانەکەم
فیدایە گیان و هەموو ماڵەکەم.

-٢-

من دارتاشێکم بێ‌کەس و هەژار
هەردەم کار دەکەم لە کووچەی بازار
بە ڕەنج شانی خۆم، نان پەیدا دەکەم
بو نیشتمانم گیان فیدا دەکەم

-٣-

هەرچەند مەتاوی ئوحرمەت بەرە
حزمەت پەی مەردم خاسنر هێنەی
کەسێم پەی چێشەن وەدەم پەرێم یار
دڵ و دەروونیش پڕجەقین و قار

# نەورۆزی رەنگین

ملکۆ عزیز

بەهارگوڵێکی رەنگین و جوانە
دیمەنی سروشتی هەموو جیهانە
گوڵ نێرگزو گوڵاڵە ورەنگین
پەرش و بلاون لەسەر رووی زەمین
نەورۆز نیشانەی خۆشی و ئاشتی یە
کاتی گورانی و پڕلە شادی یە



# تۆ نەورۆزی و منیش ئاگر بۆت ئەسووتێم

احمدی کەس



دڵدارەکەم
ئەی نەورۆزی پڕلەگوڵ و
گوڵزارە کەم. . .
ئەی بەهارە نەشئەدارە
دڵ رەوێنە بەکارەکەم. .
هەزار ساڵە
دڵداری تۆم. .
لەگری عەشقت
هەردەوێڵ و شێت و شەیداو
عەودالی تۆم. . .
لەخەمی تۆ
ئەژنۆم هێزی لێ براوە
ناتوانم بڕۆم. .
شێوا وەو
خەوو خۆراکم نەماوە. . .
ئەی نەورۆزە
پڕلەگوڵ و
گوڵزارەکەم. .
ئەی بەهارە
نەشئەدارە
دڵ رەوێنە
بەکارە کەم. . . !!
جاران بێ یەك
ئۆقرەمان نەبوو. .
بۆیەك بووبووین
دڵ بەندە، زەبون. .
تۆ لەیلم بووی
منیش مەجنون
بۆیەکتری ئەتواینەوە.
هەموو ساڵێك
هەردووك بۆیەك
ئەمردین و ئەرواینەوە. .
تۆ گوڵاڵە سوورەو
کەنێرو نێرگزت ئەهێنا بۆم. .
منیش وەکو
دێوانەو شێت
ئەسووتام بۆت
وەکو چیلکە
وەك تایە. . وەك مۆم. . . ؟!!

دڵدارەکەم
ئەی نەورۆزی
پڕلەگوڵ و
گوڵزارە کەم. .
ئەی بەهارە نەشئەدارە
دڵ رەوێنە بەکارەکەم. .
پەپولەی ئارەزووم

پەروانەیە لە دەوری باڵات. .
لەهەرکوێ بی
لێت نابمەوە. .
بۆت ئەگەرێم
وەك سندباد. .
وەرە مەرۆ
بابەڵێنی خۆشەویستی
نوێ کەینەوە. .
شەکراوی جەژنی
نەورۆزو بەهار
بخۆینەوە. .
چونکە ئەتۆ کورنۆش ئەبەی
بۆ رەشەبای پاییزو
نەلافاویش
گری خۆشەویستی دەروونی من
ئەکوژێنێتەوە. .

# نەورۆزو بەهارو یادگاری



ڕۆستەم باجەلان

دیسان مەلی خۆش هەواڵی بەختەوەر:
مزگێنی هێنا بۆ وەتەن سەرانسەر

بەدوو باڵی سەوڵ لێدەداو دەڵێ:
کوڕەی تازە بۆ کۆشی شادی هەڵێ

نەورۆزە، ڕۆیی سامی شەو لە ڕێگا
تیری هەتاو بەفری شاخانی پێکا

نێرگزەکەم ڕۆژی تازە گەڕاوە
سەرماوسۆڵی شووم نەیەڵی لەم ناوە

تا چاو برکا، گڕە لە هەموو لاوە
هەرچوار دەوری گڕ بەمنداڵ گیراوە

چیمەنی قەراخ ڕوبارو چەم و زێ
تەڵێ تاران دەلەرێنن هەر لەجێ

کەللاکەی بیر گلێر دەبێ و هەڵدەکشێ
پەرەو گەردوونی بێسنوور ڕێ دەگرێ

لە لانەی واز دەتارێ چونکە خەیاڵ
دەیبا بەرەو دەرو دەشت و شاخ و یاڵ

دیسان لەم ڕۆژە گڕەومان بردەوە
کۆنەگڕی (کاوە)مان یاد کردەوە

ئەو گڕەی پەڕوپۆی زەبری هەڵپرووزان
لەشکری شەڕی لەجێوە گشت تۆقان

دیسان گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ و دەسکەنە
بووکی زەریایان هێنا ئەم وەتەنە

نێرگزو پەلەگوڵاڵەی چریسکەدار
خزاونەتە ناو جەرگەی وەرزی بەهار

نێرگزەکەم هەرتۆ ڕۆشتی بەجارێ!
لەدڵت لانەدام خەمێ، ئازارێ

تۆش وەك نەورۆز گشت سەرەساڵ وەرەوە!
ئاورێك لە دنیای دڵم بەرەوە

دنیای دڵم ڕۆشن کە هەر لە جێوە
وەك گڕی نەورۆز هەڵگیرسێ لەنوێوە




پەخشان

# نەورۆز داستانی ئازادی یە

نوری عەلی ئەمین

(١)

مامەکاوە . .
هەی کڵپەی شۆڕش و
داستانی ئازادی . .
خۆزگە بەسەر بهاتایە،
دەستت لەگەڵ دەستمانا بوایە . .
بە چاوی خۆت بتدیایە . .
ئەوەی ئەم ساڵ سروشت،
بەسەر ئەم کوردەی هێناوە . .
لەمێژوودا هەرگیز رووی نەداوە . .
کوردستان سەرتاپا،
بە بەفرێکی ئەستوور داپۆشرێ
سەرما گەمارۆی بدا . .
رێگاوبان دابخرێ . .
گوزەران بەجارێ بئاڵۆزێ . .
بەفر مەرگی سوور دابچێنێ . .

(٢)

مامــەکــاوە . .
دەترسێن: بەهاری ئەم ساڵ،
لەتاو بەفرو سەرما دوابکەوێ . .
کەژاوەی نەورۆزیش گیربخوا . .
زوو نەگاتە گردی مامەیارە،
کاروان بخا . .

پیرەمێرد، وا بە تەمایە،
ئەم ساڵ خۆی سەرچۆپی بگرێ . .
هەتا بڵێسەی نەورۆز،
لەجاران زیاتر بەرزببێتەوە . .
قریوەی شۆرەسواران و
هۆرەی کوردی،
گیانی (شێخ)ی نەمر ببووژێنێتەوە .

(٣)

نەء . . رۆڵەکانم ،
ئاگاداری سروشتی ئەمساڵم . .
هیچ مەترسن:
ئێوە نەوەی بەفرو بارانن،
پەروەردەی،
شەختەو کرێوەو لافاوی زستانن . .
وا وەرزی ساڵ،
بەرەو بەهار دەچێ
خۆری کوردستان دەردەکەوێ
بەفرو سەرما ئەژنۆی دەشکێ . .
چیاو دەشتەکان،
تارای رەنگاورەنگ دەپۆشن . .
نەورۆزیش بە سەربەرزی،
بەرەو پیرتان دێ . .
مەرو ماڵات دەکەونە زاوزێ . .
گۆشت و پەنیرو ماست،
لەبازارا کەس نای کرێ
کارگ و رێواس پێ دەگا . .
گەنم و جۆ،
گەزگەز باڵا دەکا . .
مریشکی کوردەواری،
دەکەوێتە گارەگارو هێلکەدەکا . .
جوجەڵە هەڵ دەهێنێ،
بەرەو شارو گوندەکانی دەنێرێ . .

(٤)

رۆڵەکانم هەستن، رابــن . .
گزرەدار خرکەنەوە . .
ئاگری نەورۆزی پێ بکەنەوە . .
نەورۆزنامە،
بۆ منداڵەکانتان بخوێننەوە . .
خۆتان بگۆڕن . .
ناوماڵتان خاوێن راگرن . .
بیکەن بە شایی و هەڵپەرکێ،
با، کوردستان بەجارێ.
لە دەنگی دەهۆڵ و زورنا راپەڕێ . .
ئەوسا گیانی منیش ،
بەشادی بەسەر سەرتانا دەخولێتەوە . .
وشەی «ئازادی »و «سەرفرازی»
لەگەڵ نەورۆزا، دەدرەوشێتەوە .

* *

# سالنامەی کوردی

نجم الدين مەلا

## ▪ بەهار ▪

یەکەمین مانگمان کە(خاکەلێو)ە     ئارایشت دەری هەردەیەو کێوە
جەژنی نەورۆزو شایی‌و هەڵپەرکێ     لەیەکەم رۆژی ئەم مانگەدا دێ
مانگی دووهەمین کە(بانەمەڕ)ە     دەشت و کێو بە گوڵ جوان و بەفەرە
دۆستانی ئازیز کوڕی دڵداران     ئەچنە سەرچنار بۆ چناران

لەدوای ئەو دادێ ئەمجا (جۆزەردان     دەست ئەدەنە داس جووتیاروو سەپان
ئەمە سێ مانگەی کە ژی بەهارە     پاش وپێش ناکا هەر بەم بڕیارە

## ▪ هاوین ▪

چوارەمین پوش پەڕ هاوینــــــە     گەرما ئەگرێ بە هێزو تــینــە
بەرگ ئەکاتە بەر ڕووتەلە هەژار     بۆ دەولەمەندیش هاوینە هەوار

مانگی پێنجەمین کە خەرمانانـە     گەنم و نیسك و نۆك بکرە هەرزانە
بەرەچەی زەوی خۆی ئەخاتە گـــەڕ     زۆرداران ئەیخۆن هەژار برسی‌و لـەڕ

شەشەم (گەلاوێژ)تیشکی ئەگــــرێ     بەرگی هەتیوو هـــەژاران ئـــەدرێ
بەزللەی وەستا شاگرد ڤـاڵ ئـــەبــێ     سێو بە گەلاوێژ ڕەنگی ئـاڵ ئـەبـێ



## ▪ پایز ▪

ئەمجا حەوتەمین مانــگی (ڕەزبــەر)ە     سینــی بــۆ میوان مــیوی لــەســەرە
ترێ‌و هەرمێ‌و قۆخ سێوی سەردەشتی     بەرەچەی ڕەزان باخی بــەهــەشتــی

لەدوای ئەو هەشتەم مانگی (خـەزەڵ وەر)     درەخت ڕووت ئەبێ لـەگـەڵاو لـەبـەر
بلبلی شەیدایش بەجۆش و کوڵ     ئـەگری‌و ئەناڵێ بۆ: نەمانی گوڵێ

مانگی نۆیەمین کە (سەرمــاووز)ە     سەرما ئەهێنێ‌و دوایــی پــایــزە
بێ‌لانەو بانیش کزن لــەسـەرمــا     بۆ بەرگ و خۆراك ئەکەونە سـەما

## ▪ زستان ▪

دەیەم(بەفرانبار)سەرەتای زستان ئەوەی پێی ئەڵێن: بەهاری مـەستــان
سپی پۆش ئەبێ دەشت و هەردو شـاخ     ئـیتر نـابینی سـەوزە لـەنـاو باخ

پانزەمین مانگیش کە (ڕێ بـەنــدان)ە     بۆ ئامشۆی دۆست سەخت وگــرانــە
بەفر ئەبارێ تــا پشتـێنـەی پـیـــاو     هاوین دڵ گەرمین ئەمین ئەکەین بەفراو

دوانزەمین مانگی(ڕەشـــــەمــــە)دادێ     مژدەی نەورۆزو گوڵانــی هــا پــێ

بەم پێیە ساڵ و مانگمان تەواوە.
لە زۆرداری چەرخ کورد نەگۆڕاوە
* * *



# سابات‌ه‌كه‌ی خاڵه ره‌جه‌ب

ره‌جه‌ب

●ئه‌گه‌ر شێرێك خاڵه‌ی راونـاو خاڵـه‌ش چووه سه‌رداریكی به‌رزو شێره‌كه‌ش هاته بن داره‌كه وه‌ستا ، ئه‌وسا خاڵه چی ئه‌كات . . ؟

صلاح الدين سلمان السندي ـ زاخو

○هێلانه ئه‌كه‌م . . !!

●بۆچی یانه‌ی وه‌رزشی شه‌قلا وا هاوبه‌شی تصفیاتی كاسی جیهانی ناكات؟

وه‌لی احمد عمر/شه‌قلاوا

○خه‌به‌ریان ناده‌نێ !!

●ئایا خاڵه ره‌جه‌ب پاپوچی ئه‌پیدایه‌یان كلاش؟

به‌ناز حمد كۆیی ـ كۆیه

○پێ خاووسم !

●خاڵه‌گیان من جه‌رگ ئه‌فرۆشم حه‌زی لێ ئه‌كه‌ی؟

مصطفى فراش شاویسی ـ هه‌ولێر

○ئه‌ی جه‌رگی خه‌سووم نافرۆشی !!

● خاڵـه ره‌جه‌ب هاوڕێیـه‌كم هه‌یه‌نـاوی رزگاره زۆری رق لێته چی‌بێ بڵێم چاكه؟

هیوا هه‌یه‌ره ره‌حیم /سلێمانی

○خوا رزگاری كات !!

●خاڵه ره‌جه‌ب رات چی‌یه به‌رانبه‌ر به‌م شیعره؟

باڵات به‌رزه قه‌دت باریك
ده‌نگت خۆشه گۆرانیه‌كانت بۆ بڵێ

طاهر كریم علی/بێ ناونیشان

■ده‌شتی شاره‌زوور گوڵ گوڵ مه‌ره‌زه
ئافه‌رین مه‌ریوان بۆ په‌مه‌گه‌ت .

●خاڵه ره‌جه‌ب بۆ ئه‌وه‌نده خه‌سووت خۆش ئه‌وێ؟

عطوالله سعید محمد/كه‌ركوك

○له‌ترسانا!!

●خاڵه گیان بۆ ئه‌وه‌نده هێنده گرانه؟

به‌روز احمد حسن/هه‌ولێر

○مریشك ده‌ست ناكه‌وێ!!!

●ئـایا خاڵـه ره‌جه‌ب گورانی هه‌ڵپه‌ركێ ئه‌زانی یان لاوك و حه‌یران؟!

محمد سلیم منتك/هولێر

○گۆرانی دیسكۆ.

●خاڵه گیان تازه‌ترین مۆدێل لای ئافره‌تان چی‌یه؟

أیوب احمد حسن/سلێمانی

○پیاوی سه‌رسپی !!

●خـاڵـه ره‌جه‌ب بۆچی كچـان زۆر زوو كوڕان فه‌رامۆش ئه‌كه‌ن؟

سه‌ربازپه‌ژاره/هه‌ولێر

○كوڕان تاقه‌تیان نی‌یه !!

●راسته ئه‌ڵێن سمێڵی خاڵه ره‌جه‌ب ده‌ست كرده

صباح علی كریم /كه‌لار

○ئه‌ء خواكرده .

●خاڵه ره‌جه‌ب تۆ بۆ كورت و سه‌رگه‌وره‌ی؟

ش.م.خ /هه‌ولێر

○هه‌مووی عه‌قڵه عه‌قڵ !!

● راسته ئه‌ڵێن خاڵه ره‌جه‌ب شه‌و له سه‌رشه‌قامه‌كان ده‌خه‌وێ؟

ناصح فارس بلباس

○هه‌رشه‌وێ خه‌سووم له‌ماڵی ئێمه‌بێ !!

● راسته ئه‌ڵێن خاڵه ره‌جه‌ب تاقانه‌یه؟

عمر ابراهیم محمد/سلێمانی

○نه‌ء ، دووانه‌م !!

● خاڵـه من حه‌زم له كچێكـه چه‌نـد جار ده‌ی بینم ده‌ست ده‌كات به‌گریان ، ئه‌بێ هۆی چی‌بێ؟!

ره‌سول احمد ئاكو/شاوه‌یس

○لێت ئه‌ترسێ !!

● خاڵـه گیـان له‌م به‌ینـه‌دا جه‌ژنی له‌دایك بوونی خۆشه‌ویسته كه‌مه چی‌پێشكه‌ش بكه‌م باشه؟

علی عزیز حمه‌أمین /سلێمانی

○مریشكێك و ته‌به‌قێ هێلكه !!

● خاڵه ره‌جه‌ب ئایا هه‌ڵپه‌ركێی سێ پێی ئه‌زانی؟

صلاح عباس عمر /هه‌ولێر

○من به‌س دوو پێی ئه‌زانم !!

● خاڵـه گیـان من كچێكم خۆش ئه‌وێ ئه‌وحه‌ز به چاره‌ی من ناكات چی بكه‌م باشه؟

محمد احمد حسین/داقوق

○به‌سۆپه‌رێك بچۆبه به‌ر ماڵه‌كه‌یاناو حه‌قت نه‌بێ !!

●خـاڵـه ره‌جـه‌ب هه‌رمـاوی
ئه‌ڵـێـی تـاوه‌ی قـوپـاوی
له‌گـه‌ڵ گۆڤـاری ره‌نگـین
له‌دڵی خـوێـنـه‌را مـاوی

محمد سعید سعدون/سلێمانی

○من گه‌ر تاوه‌ی قوپـاوبـم خاڵی
گشت لایه‌كتـان بـم
گرنـگـه حاڵم زۆر چـاكـه
تـوش هـه‌تـا زووه راكـه

# بەئیمزاکەتا خۆت بناسە



● خوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست، هەر کەسێك ئەیەوێ بە ئیمزاکەی خۆی بناسێ با پەیرەوی ئەم خاڵانە بکات، ئەگینا بە تەمای هیچ نەبێ. . !!

١ ـ لە کۆپونی گۆڤارەکەدا ئیمزاکەی بنێرێو لەسەر زەرفەکە بنوسێ گۆشەی ئیمزا.

٢ ـ بە قەڵەمی پاندان یان جاف رەش ئیمزاکەی بکات و باتۆخ بێ.

٣ ـ پولێکی (١٠٠) فلسی لەگەڵ دا بێ‌و ئێمە ممنون.

سەرناسی رەنگین



● محسن ولی سعید ـ هەولێر، رارایت، بیرت بڵاوە، ناتوانی ژیانی خۆت رێك بخەیت، ئاگات لەخۆت بێ.

● عارف عمر علی ـ کەرکوك، ژیانت زۆر قورس گرتووە، دەرونت پریەتی لەگرێی سەیرسەیر، واز لەو دڵ تەنگیە بهێنە.

● قارون رحیم رۆژبەیانی ـ چم چماڵ، حەزت لێیە بێ بەشت و نازانی هەوڵی بۆ بدەی، درێژە بەشت مەدە.

● شیلان مصطفی کاکە عبداللە ـ کەرکوك. شیلان خان تۆ هێشتا منداڵی. واز لە دوودڵی‌و رارایی بهێنە.

● سمکۆ احمد عارف ـ کەرکوك. دڵ ساف و بێ فیزو بەرەوشتی دووا رۆژێکی باشت هەیە.

● محمد نوری احمد ـ سلیمانی. خەریکی خوێندنی خۆت بە، واز لە شتی لابەلایی بهێنە.

● فاضل محمد. قضاء بلد بێ هیوا مەبە. دڵ تەنگ مەبە. کار نییە خوا چاکی نەکات. هەر سەبرت هەبێ سەرئەکەوی.



● فریاد عادل کاکەیی ـ عەلی سرا، واقیعیانە بیر ئەکەیتەوە، حەز لە هونەرو رێك وپێکی ئەکەیت.

● رزگارمستەفا ـ کەرکوك، حەز لە پلەو پایەی بەرز ئەکەیت و نازانی چۆن پەیدای بکەی.

● سهیلە شفیق عبدالرحمن ـ کەرکوك، پاشە رۆژت باشە بەردەوام بیت ئەگەیتە ئەنجام.

● دلێر صدرالدین حمید بەرزنجی ـ هەولێر، درێژە بەشت مەدە قسە هەزارەو دووانی بەکارە، لاسایی خەڵك مەکەرەوە.

● خەندە طلعت توفیق کەورو گوسکی ـ هەولێر، ئەگەر خۆت بە دڵدار ئەزانی دڵداری وانابێ، خەریکی ئیشی خۆت بەباشترە.

● فاضل کاکەیی داقوق ـ بەرەوشتی، حەز لە هونەر ئەکەیت، حەزت لە ماڵی دنیایە. زۆر پەلە ئەکەیت.




بەرای من ئەگەر کار وابڕوات
لەمەو دووا فەرمانبەرەکانمان
بیجامە لەبەرکەن باشترە!!!


کێ ئەتوانێ قسەبکات...
ئێمە پێیشتی بەشەرئەگرینەوە
کێ ئەتوانێ بێ بەلامانا..!!
بازرگانی چاوچنۆک



# یاری زانی ئوسکتلەندی
# • جون وارك•

*ناوی تەواوی :-(جۆن وارك)ە.

*مێژوو وشوێنی لەدایك بوونی:- کلاسکو، ٤ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٧

* یاری کۆمەڵایەتی:- ژنی هێناوە.

* جۆری ئۆتۆمبیلی:- فۆرد کۆرتینا.

* یانەی پێشووی:- ئیپسوسج تاون.

* یانەی پێستای:- لیڤەرپول

*باشترین نازناوی یاریزان:-وارکی.

*باشترین ڕۆژنامە بەڕای جۆن وارك:- ڕۆژنامەی (دایلی ریکۆرد)ی ئوسکتلندی.

* ئەم یاری زانەی کە وارك لای باشە:- دینیس لو.

● جگەلە تۆپی پێ چ یاریەکی تر پەسندنەکەی

- سەکواش

● باشترین هەڵبژاردە بەڕای تۆ

- جینینغز، کارلۆس ئەلبرتۆ، پاکنپاور، بیتی، کۆپر، بریمز، پنتزر، بیست، بیلیە، دینیس لو

●خۆشترین یاری کە کردوتە

- یاریهان بەرامبەر ئینگلیز لە یاریگای بەناوبانگە ویمبلی لە ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩.

● ناخۆشترین یاریت

- دۆراندنهان بەرامبەر تیپی ئینگلیز.

●جوانترین یاریگا کەیاریت تێداکردووە

- بەرشەلۆنە لەئیسپانیاوە هەروەها یاریگای نیوکامپ.

●خۆشترین شت لەلات

- تۆمارکردنی گۆڵی زۆر.

●جوانترین فلیمی کەدیوتە

- ڕاکردن لەسەرکەوتن

● جوانترین شارلە جیهان کەدیووتە

- دورگەکانی ئیسلەندە

● ئەتەوێ بگەیتە ئاستی کام یاریزان

- گەوهەری ڕەش (بیلیە).

● هیواو ئاواتن

- لە هەڵبژاردەی ئوسکتلەندە یاری بکەم...

ئامادەکردنی -
محمد سعید قادر - هەولێر



## بۆ جوانیی ژووری چێشتخانەکەت

دیکۆر سازانی ڕۆژاوا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەخۆوەکەون تا جوانترین کەلوپەلی ناومالّ بۆ کەیبانوو دابهێنن.

وا کۆمەڵێك ئامرازو کەلوپەلی ناومـالّ لە بازارەکـان دا دەبینین کە بریتین لە قووریی ڕەنگیـاوڕەنگی چایێ کە لە سیـرامێـکـی ساردو بایریکس و لەکان دروست کراون و شێوەو قەوارەیان سەیرو دەگمەنە. بەلاّم لەلایـەن کەیبانـووانـەوە پەسەندکراون. دە ئەی کەیبانووی مالّە کورد تۆ دەلێی چی؟



## چنینی دەست ڕازەیەك بۆ منالّە ساواکەت

بەشیشی نمـرە(٨)ب(٤٠)دەنـك دەست پێبکـە بە پێنـج ڕیـزی حاشیەکەی دەنکێك بەم دیودا،ە وە دەنکێك بەودیوا بچنە - بەم جۆرە دەست پێبکە بە مۆدیلی چنینەکە.

ڕیزی یەکەم: دوای حاشیەکە بەم دیـوا (عـدل) بچنـە تا دەگـاتە ناوەڕاستی دەست ڕازەکـە، بەپێی ئارەزووی خۆت بە دەزوکـە ڕەنگاوڕەنگ شێوەی (سێ گوشە، چوار گۆشە)بچنە هەمووی بەم دیوا(عدل)بچنە.. تاد.

کە گەیشتـە ئەو درێـژییەی کە تۆ دەتەوێ حاشیەکەی کۆتایی دەست پێبکـە دەنکێـك بەم دیـودا، وە دەنکێك بەودیودا تا پێنج ڕیز تەواو دەبێ، ئینجـا دەنـك.. دەنك کەم دەکـرێتـەوە پانزە دەنك لەلایەك، وە پانـزە دەنـك لەلاکـەیتر، بەمەی ڕجێك (١٠) دەنك لە ناوەڕاست بمێنێ.

ئەویشیان هەروەك حاشیەکە بچینە تا درێـژی (١م) ئیـنـجـا بۆ ڕازانـدنـەوەی دوای دەسترازەکە بە چەنـد دەزویـەکی ڕەنگـاو ڕەنـگ چەند گولینگەیەك دروست بکە.

## تەبسی ماسی بە ڕوبە هەنار

کەرەستە

کیلۆیەك ماسی، ٣سەلك پیاز، ١/٢کیلۆ تەمـاتـە، ٣بیبـەری سەوز، ١/٢کوپ ڕوبە هەناری ترش، ٢کـەوچـکـی چێشـت خواردن ڕۆن، ٢لیمۆی بەسرە، خوێوبیبـەری ڕەش و یەك قنچك سیریان بەپێی ئارەزو، دەسکێك کەرەوز.

ڕێگەی دروست کردن

١- ماسییەکە پاك ئەکرێت و پارچە پارچە ئەکرێ یان یەك پارچە بەکاردێت

٢- پیـازەکە بەشێوەی بازنەیی لەت لەت ئەکـرێ‌و نیوەی ئەکرێتە سەر سینیەکە



[...]جارە، مۆدەی جل وبـەرگە هەربـۆ گەوران نییـە، کەوا دەزگـایـەکی جیهـانی جل وبـەرگی بەنـاوبانگ کۆمەڵێکی هەموو جۆرو ڕەنـگـاو ڕەنـگ جل وبـەرگـی کیژوولەی تەمەن ٣- ٧ سالّی پیشان دا.

مۆدەی ئەم جل وبـەرگـانـەش بە سادەو ڕەنـگـی هێـمـن و گونجـاو خۆیان دەنواند. کەوا ڕەنگی پەمەیی کالّ لەهەموو ڕەنگی دی زیاتر بوو. دەتـوێش خانمـەکـەم بۆ کچـۆلـە جوانەکەت شتێکی جوان هەلّبژێرە.

# شەکی خۆجوان کردن و چۆنیەتی بەکارهێنانیان



خوشکی بەڕێز. هەموو شمەکێکی خۆجوان کردن هەرچەندە جوان و باش بێت لەلایەن دروست کردنی، بەڵام گرنگ ئەوەیە بزانیت چۆن بیگونجێنیت.

خوشکی هێژا:-

لێرەدا باسی چونیەتی بەکارهێنانی کرێمی دەموچاو دەکەین.

- چۆنیەتی لێدانی کرێم لە دەموچاو هەروەك لە وێنەکان دا دەرئەکەوێت.

١- چۆنیەتی لێدانی کرێم لە بەیانیان دا (وێنەی ژمارە(٤) هەندێکی بکەرە سەر دەموچاو ئینجا بە هەر دوو دەست بە باشی بە دەموچاودا بڵاوی بکەرەوە مل و پێلوەکانت لەبیر نەچێت.

سوودی کرێمی بەیانیان بۆ پاراستنی پێستە لە وشك بونەوەو ترەکاندن.

٢- لێدانی کرێمی شەوان(وێنەی ژمارە(٣)

کرێمی شەوان کرێمی بنەرەتی‌یە، پێویستە بە باشی دەموچاوت بشۆیت و ئینجا هەندێ بدەیت لە دەموچاو پاشان دەست بە پیاهێناتی دەکەیت لە ناوەڕاستی دەموچاوەوە بۆ دەرەوە بە دەست پیاهێنانێکی بازنەیی لە سەرخۆ کۆتایی پێ بهێنە، یرەدا باسی

٣- چۆنیەتی بەکارهێنانی لوسیون (وێنەی ژمارە(٢).

کەمێکی بکەرە سەر پەنجەکانی دەستت و بەئەسپایی بیهێنە بەدەموچاوت دا هەموو پیس‌و چەوری هەیە لای‌ئەبات پاشان بەدەست بکێشە بەدەموچاوو ملت دا بۆ ئەوەی دەموچاو بیوژێتەوە، پاشان وازی لێ‌بهێنە تا لوسیونەکە، خۆی وشك ئەبێتەوە دیسانەوە جارێکی‌تریش ئەوەی باسمان کردن دووبارەی بکەرەوە.

هەروەهاسوودی لوسیون ماکیاژ پاك دەکاتەوە باش پێست پاك ئەکاتەوەو هەموو پیس‌و چەوری‌یەکی لێ ئەکاتەوە.

٤- چۆنیەتی لابردنی ماکیاژ (وێنەی ژمارە (١)

بەهۆی ئاوو سابونەوە یاخو هەر هۆیەکی‌تری پاك کردنەوە سەرەتا ئەیخەیتە ناوەڕاستی دەموچاوەوە ئینجا بەشێوەیەکی بازنەیی دەست بای ئەدەی بۆ دەرەوە تاوەکو لەسەر پێست لائەبەیت بۆ پێلوەکانیش لەگۆشەکانی ناوەوە دەست پێ‌ئەکەیت بۆ دەرەوە لە کۆتایی‌دا بە پارچە لۆکەیەك بیسرە.

مەبەست لەلابردنی ماکیاژ هەر ئەوەندە نی‌یە ماکیاژەکە لاببەیت بەڵکو پاك و خاوێنی دەموچاو ڕزگارکردنی لە تەپ و تۆز کە پێوەی لکاوە، هەتاوەکو ئەگەر ماکیاژیشی پێوە نەبێت پاك کردنەوەی زۆر گرنگە.

٥- چۆنیەتی بەکارهێنانی کرێمی بنەرەتی یاخود بنەرەتی دەموچاو (وێنەی ژمارە(٥)

پاش ئەوەی شووشەکە بە باشی ڕائەوەشێنیت هەمووی بکەرە سەر دەموچاو هەروەك لە وێنەکەدا دەرئەکەوێت ئینجا بەسەری پەنجەکانت بەدەموچاوت دا بڵاوی بکەرەوە تاوەکو هەست ئەکەیت ئەو کرێمەی بەدەستەوەیە وشك بووەتەوە.

ئەو کەرەستانەی کرێمی بنەرەتی لێ‌دروست کراوە بریتین لە ڕووەکی گوڵی دارو گژوگیاو زوو خراپ ئەبن و ئەنجامێکی باش نادەن بەدەستەوە ئەگەر هەوای لێ بدا یاخود بەر گەرمایێکی زۆر، بۆیە پێویستە ئەو شووشە بۆ یەك جار هەروەها وا باشترە شوشەی بچووك بەکاربهێنیت.

**بەهرە بەکر ئەحمەد**



٣- ماسیەکە لەسەر پیازەکە دائەنرێ

٤- باقی پیازەکە وسیرو لیمۆ بەسرەکە دەنکی لێ دەریەت و لەگەڵ بیبەرە سەوزەکە ورد کرابێت و تەماتەکە بەشێوەی بازنە لەت لەت کرابێ هەمووی ئەکرێ بەسەر ماسیەکەدا

٥- روبە هەنارەکەو هەندێك ئاوو رۆن ئەکرێ بەسەر هەمووی‌دا

٦- سینیەکە دائەپۆشرێت و ئەخرێتە ناو فرنێکی مام ناوەندی گەرم و سەری سنیەکە لائەبرێ پێش ئەوەی ماسیەکە پێ‌بگات بۆئەوەی ڕووەکەی سور بێتەوە ئینجا

کەرەوزە جنراوەکە ئەکرێت بەسەر ڕووەکەیدا دوای پێشکەشتن پێش کەش ئەکرێ بە گەرمی

ئەتوانین سرکە یان تەمرهندی یان ئاوی لیمۆ بەکاربهێنین لەباتی روبە هەنار

**بدرية محمود عبدالله**

# خوایە وەتەن ئاواکەی

سیناریۆی /کاروان

وێنەی سیناریو/ایمان خضر















شیعر بۆمنداڵان

نەورۆز

کوڕگەل ئەمڕۆ نەورۆزە
جەژنی کاوەی سەرهۆزە
ڕۆژی گەشت و جوانییە
بەهارە ئاوەدانییە
خۆ نێرگز و گوڵاڵە

بڕێی نێو دەشت و یاڵە
دەیبڕۆن بیهێننە نێو شار
بیکەن بەدیاری دڵدار
نەورۆزەو بەهاری نوێ
چیدی هیواتان نەنوێ

چونکە نەورۆز هیوایە
مژدەی گەشتی لەدوایە
دایکەو دایکی نێرگزە
ناحەزمانی پێی کزە

سەلام عومەر کەریم





# نامەکانتان گەیشت.. زۆر سوپاس

● ئامادەکردنی: ئازاد شوان ●

خوێنەرانی ئازیز جاری لەپێش هەموو شتێکا گەرمترین پیرۆزبایی جەژنی نەورۆزتان لێ ئەکەین و هیوای خۆشیتان بۆ ئەخوازین.. ئەمجارەش نامەیەکی فرەی ئێوەی بەرێزمان پێگەیشتووە وا لێرەدا وەڵامی هەندێکیان دەدەینەوە بۆ ئەوانی تریش خوا کەریمە..! راستیشتان دەوێ زۆربەی بابەتەکان شیعرن. بەڵام بە تەرازووەکەی ئێمە زۆریان میعرن..! خاڵێکی دیکەش هەیە دەمەوێ بیڵێم ئەویش ئەوەیە کە هەندێکتان جار جار باش دەنووسێ، بەڵام ئەوەندە پەلە دەکات و زۆر دەنووسێ، سەر لەخۆی دەشێوێنێ و پلەی نووسینەکانی بەرەو کزی دەروات، بۆیە بەو برایانە دەڵێین کەپەلە نەکەن و هێدی هێدی هەنگاو بهاوێژن، چونکە جیهانی ئەدەب بە زۆربێ و بۆربێ نییە..!

برایانی بەرێز.. هیوادارم لە قسەکانمان دڵ تەنگ نەبن و ئێمەش مەمنون..



● برایان.. خالد شێخ خالد: خەندە، تەرمی هیوا ـ ـ بەهجەت حمید مەمووندی: نیگای ژینم ـ انور نادر پونگینەیی: سکالا بۆ رەنگین، دەڵێن بەیانی جەژنە، دیمەنێکی خەماوی ـ سامان هەورامی: خەونێك ـ خالد حسن چۆمانی: ژیان و ئەشکەنجە ـ سیروان شوان: پەیمان ـ ناصر حسن محمود: چرپەیەك ـ طارق رشید نادر: شەهید ـ ئاوارە: دووری من ـ جعفر صادق محمد جەباری: بانگی دڵداری ـ شلێر عبدالرحمن: جوانی روخسارت مامۆمندالان ـ اسماعیل نادر ئاڵلایی: پەروانەی دەوری چراتم ـ عبدالله صابرئەژی: خەرەندە نشین..

داوای لێبووردنتان لێ ئەکەین و بەتەمای بەرهەمی چاکترتانین.. سوپاس

● برایان.. فاخر بڵباس، جەزا نوری حەمە طالب، ژاکاو عباس.. بۆ خاتری خوا.. سەد جارمان وت لەهەردوو دیوی کاغەز مەنووس و با خەتەکانتان هەندێ خۆش بێت و دێر بەجێبهێڵن.. کەچی زۆربەتان گوێی لێ نییە.. ببورن لە مەرجەکانی نووسین بۆ رەنگین لاتان داوە..

● کاکە شوان باجەلان لە شاری هەولێری دێرینەوە باسێکی زانیاری لەژێر ناونیشانی (ئایا رۆژنامەی ئەلکترۆنی جێگای رۆژنامە وەرزشییەکان دەگرێتەوە)بۆ بلاوکردنەوە بۆ ناردووین

ـ کاکی ئازیز ببورن لە بلاونەکردنەوەی باسەکەتان چونکە.. نە سەرچاوەی باسەکەتان نووسیوەو نە وێنەشی لەگەڵدابوو، بێجگە لەوەی کە وەرگێرانەکەتان لاوازبوو. هیواداریین لەمەودوا باسی باشترمان بۆ بنووسن.. سوپاس.

● هاورێی هەمیشەیی گۆڤارەکەمان کاك پەرۆش کاکەیی باسێکی لەژێر ناونیشانی (قەزاو قەدەر)بۆ ناردووین و چاوەروانی بلاوکردنەوە دەکات.

ـ کاکی برای ببورن.. کاتی ئەم شتانە بەسەرچووە، چاوەروانی بابەتی چاکترتانین.. گەلەك سوپاس..

● هاورێی ژیکەڵەی خۆشەویستمان کاکە ئاسۆ خەلیل کاکەویس، پۆلی چواری سەرەتایی، لە شاری کەرکو ك ـ ی ئازیزەوە دوو وێنەی جوانی دەستکردی خۆی بۆ ناردووین کە بلاویان بکەینەوە، خۆزگەی ئەوەشی خواستووە کە گۆڤارێکی کوردی بۆ مندالان دەربچووایە بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی خۆیانیان تیادا بلاوبکردایەتەوە..!

+ کاکی جوان و هەست بەرز.. پر بە دڵ سوپاست دەکەین و هیواداریین لە داهاتوویەکی نزیك دا پێشانگایەکی تایبەتی بۆ تابلۆو وێنەکانت بکەینەوە، هەروەها ئێمەیش لە گەڵتا خۆزگە دەخوازین و هیوامان بەرزە بەوەی کە بەزووترین کات خۆزگەکانمان بێتە دی، ئێمەیش بە گوێرەی توانای خۆمان ئەوەی بۆمان دەکرێ بۆ تۆو هەزارانی وەکو تۆی مندالْ و هیوای پر لە رووناکی پاشە رۆژی گەلەکەمان کەم تەرخەمی ناکەین.

*خوێنەرانی خۆشەوست.. ئیتر بەخواتان ئەسپێرم.. زۆر سوپاس*

# یەکتر ناسین

ئامادەکردنی : لیلی لطیف



ناو: هێڤن صلاح اسماعیل
تەمەن : ١٩ساڵ
ئارەزوو: گوێ گرتن لە مۆسیقا
ناونیشان: زانکۆی صلاح الدین کۆلیجی پەروەردە/بەشی زیندەوارزانی



ناو: بیان محمد محمد
تەمەن : ٢٠ساڵ
ئارەزوو: وەرزش و/مۆسیقا
ناونیشان: زانکۆی صلاح الدین کۆلیجی پەروەردە /بەشی وەرزش



ناو: ڕێبوار رشید زەنگنە
تەمەن : ١٧ساڵ
ئارەزوو: نامەگۆڕینەوەو/وەرزشی
ناونیشان : کرکوک/گەڕەکی شوریجە



ناو: ڕێکوت رشید زەنگنە
تەمەن : ٧ساڵ
ئارەزوو: نامەگۆڕینەوەو/وەرزش
ناونیشان: کرکوک/گەڕەکی شوریجە



ناو: عبدالله علي عبدالله
تەمەن : ١٩ساڵ
ئارەزوو: نامەگۆڕینەوەو خوێندنەوەی گۆڤاری رەنگین
ناونیشان: سلێمانی ـ سرچنار



ناو: جعفر صادق محمد
تەمەن : ١٩ساڵ
ئارەزوو: نووسین و خوێندنەوەی شیعری کوردی
ناونیشان : کرکوك/گەڕەکی حریە ژمارەی دەرگا ٤٣٥



ناو: مصطفی حەمە علي أمین
تەمەن : ٢١ ساڵ
ئارەزوو: خوێندنەوەی گۆڤارورۆژنامە وکتێب
ناونیشان: سلێمانی/دەربەندیخان/



ناو: نەریمان محمد سعید
تەمەن : ٢١ساڵ
ئارەزوو: وێنەگرتن و راوشکار
ناونیشان: سلێمانی/دەربەندیخان ـ گەڕەکی سەرا ژمارەی خانوو/٦٦/٤٤٤



ناو: واحد عبدالکریم رحمان
تەمەن : ١٩ساڵ
ئارەزوو: نووسینی شیعرونامە گۆڕینەوەو هونەر
ناونیشان: هەولێر ـ گەڕەکی ١١ی ئازار



ناو: کامەران احمد خۆشناو
تەمەن : ١٨ساڵ
ئارەزوو: هونەرو/نامەگۆڕینەوە
ناونیشان: هەولێر/ گەڕەکی منتکاوە ژمارەی خانوو ١٥٥/٣/٦٤



ناو: محمد محمد أمین چۆمان
تەمەن : ١٦ساڵ
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو ـ پەروەردەی ئاینیو وشیعردانان
ناونیشان: ناحیەی حەریر



ناو: کریم حمد أمین وێنەگر
تەمەن : ٢٢ساڵ
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوە وێنە گرتن
ناونیشان: قەزای سەدیق ستودیۆی

ئارەزوو



ناو: سەروەت محمد والی
تەمەن : ١٨ساڵ
ئارەزوو: خوێندنەوە/ نامەگۆڕینەو
ناونیشان: توزخورماتو/ گەڕەکی کۆماری



ناو: لشکری احمد میرو
تەمەن : ١٤ساڵ
ئارەزوو: نووسین و خوێندنەوە
ناونیشان: کۆمەڵگای حریر پۆلی سێیەمی ناوەندی



ناو: أحسان محسن حسن
تەمەن : ١٨ ساڵ
ئارەزوو: وەرزش و خوێندنەوە
ناونیشان : صلاح الدین/دوز/ئامادەیی/ دوز



ناو: عبدالله احمد سلێمان
تەمەن : ٢٠ساڵ
ئارەزوو: وەرزش و وێنە کێشان
ناونیشان: سلێمانی/گوێژەی تازە



ناو: سامان احمد کریم
تەمەن : ١٨ ساڵ
ئارەزوو: مۆسیقاو وێنەکێشان
ناونیشان: سلێمانی، ناوەندی نالی کوران



ناو: سەردار عبدالله احمد
تەمەن : ١٨ساڵ
ئارەزوو: مۆسیقار شانۆ
ناونیشان : سلێمانی ـ گەڕەکی ئازادی ژمارەی خانوو ٦٧٧/٨٣



ناو: قارون رحیم نجم رۆژبەیانی
تەمەن : ١٨ساڵ
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو توپێنی
ناونیشان : چەم چەماڵ/ شۆرش



ناو: کمال قادر ابراهیم
تەمەن : ٢٠ساڵ
ئارەزوو: نامەگۆڕینەوەو خوێندنەوەی شیعر
ناونیشان: کفری /١٧تموز



ناو: ئاوارە خورشید قادر
تەمەن : ١٧ساڵ
ئارەزوو: خوێندنەوەو نامەگۆڕینەوە
ناونیشان : هەولێر/کۆمەڵگای بنەصلاوە سەرتاشخانەی کارگەر



# قەڵەم کردن و قەڵەم چاندن لە باخچەی ناوماڵ دا

● ئەگەر باخچەی ناوماڵ پان و پۆرو بەرفراوان بێ ، ئەتوانی کەڵکی ئابووریی زۆری لێ وەربگری ، بەبەکارهێنانی رووبەری زیاد لە پێویستی کاروباری باخچە بۆ چاندنی قەڵەم وزۆر کردنی دارو درەختی‌میوە، وەك مێو، هەنجیر، زەیتون و هەنار وگەلێ جۆری تریش ، کەئیتر پێویستیت بە شەتڵ کرین نابێ و پارەیەکی باشیشت بۆئەگەرێتەوە. ئەم رێگایە بۆ زۆرکردنی دارو درەختی بەردار لە باخچەی ناوماڵ دا رێگایەکی زۆر ئاسانەو هیچیشی تێ ناچێ وکات و جێگای زۆریش ناگرێ.

● لەم کاتانەدا ئەتوانی قەڵەم لەداروودرەختی ناوباخچەی خۆت یان لەهەرکوێی ترەوە بیهێنی و لە باخچەکەت دا بیچێنی ، بە مەرجێ قەڵەمەکان لەدارو درەختی ساق و سەلیمەوە وەرگیرابن بۆ ئەوەی ئەنجام و بەروبوومی باش بدەن بەدەستەوە ودرێژیی هەریەکەشیان ، ئەبێ ٢٥-٣٠سم بێت و ئەبێ، لەسەرەوە بەرێکی ببرێت و لەخوارەوەش بەخواریی وئینجا ئەچەقێنرێتە ناوخۆڵ و ئیترئەبێ خزمەت بکرێ و ئاوی باش بدرێ و هەر بەم جۆرەش ئەتوانرێ گوڵ و رووەکی رازاندنەوەی باخچە بچێنرێ وەکو گوڵە جەهەنەمی و راسقی و یاسەمین وگوڵەباخ و گەلێکی تریش .







کریم سعید احمد
ئەندازیاری کشتوکاڵیی
لە شارەزوور

هونەر



# جوان و درندە

## کاترینی جوان کوژراوە درندە بەتەنیا مایەوە..؟!

لە ساڵی شەستەکان فلیمێکی ئەفسانەیی ـ دوو بەش بوو بەناوی (امیر ارسلان)و(قزل ارسلان) لە پەردەکانی سینەمای عێراق ئیشی دەکرد. ئەم فلیمە تاکو رادەیەکی زۆر سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنابوو و جەماوەرێکی زۆری بەدەوری خۆیدا کۆ کردبووەوە ، هەر لەتەك ئەم فلیمەش دا لە عێراقی خۆشەویستمان پەردە لەرووی چەند فلیمێکی ئەفسانەیی تری وەکو (سندباد البحری)و (حاجی ئاغا)و(چشمەئاب)و (حسن کەچەڵ) هەڵدراوەتەوەو بینەران بەبینینی سەرسام بوون لە نێو هەموو گەلێك چیرۆکی ئەفسانەیی هەیەو بەهەموو توانایەکیشیەوە هەوڵ دەدات وا لەرۆڵەکانی بگەیەنێت ، لە چیرۆکەکە راستەو رووداوەکە راست بووەو پاڵەوانەکان کەسیەتی بەراستی بوونەو لەنێو کۆمەڵ دا ژیاون بەڵام ئەم چیرۆکانە کەی دەکرێتە فلیم و ئەم چیرۆکانەش کە زۆربەیان ئێجگار درێژن ئایا لە فلیمێك دا بە بەشێك و دوو بەش و سێ بەش کۆتایی دێت یاخود بڵێین ئایا چی دەزگایەکی هونەری هەیە بتوانێت چیرۆکی (الف لیلة ولیلة)هەزارو یەك ئەلقەی لێ دەربهێنێت وچی دەوڵەتێکیش ئامادەیە بەهەزارو یەك شەو ئەم چیرۆکە بەهاوڵاتیان پیشان بدات.

زنجیرەی (جوان درندە) سێ بەشی لێ دەرچووە و لە بەشی سێیەم دا (کاترین)دەکوژرێت و (فنسنت) کە لە دەوری (درندە)دایە بەتەنیا دەمێنێتەوە. ئینجا نازانین چ بەشێکی تر لەم زنجیرەیە دەردەهێنرێت یان نەء

خانم لیندا هاملتون دەوری (کاترین) دەنوێنێت لیندا لە ٢٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٧ز لەشاری (سالزبۆری)ی ئاستانی فیرلاندی ئەمریکایی لەدایك بووە.

باوکی لە رووداوێکی دڵتەزێنی ئوتۆمبیل دا دەمرێت. لەگەڵ خوشکێکی جمکی خۆی دا بەتەنیا دەمێننەوە. بەتاوانی تلیاك کێشان پێنج ساڵ بەندکراوە ساڵی ١٩٨٢ز لیندا لەگەڵ بروز ئەیوت یەکتر ئەناسن دوای ئەوەی دەوری سەرەکی لە فلیمی (تاج)دا دەبینێت وشووی پێ دەکات. .

دوای هەشت ساڵی شووکردن ئێستا چاوەروانی یەکەمین منداڵی دەکات و دەڵێت:ـ

واچاکترە (درندە بچووکە جوانەکەی )خۆم بەخێو بکەم و چی تر لەگەڵ درندە گەورە (رۆن بیرلمان)کە دەوری (فنسنت )دەگێرێت بەشداری نەکەم و واز لە بەشەکانی تری ئەم زنجیرەیە بهێنم.

## بۆ پێکەنین

کابرایەك کات ژمێری ٢/٣٠پاش نیوەشەو تەلەفۆن دەکات. بۆ دراوسێکەی بە پێکەنینەوە دەڵێت: رۆژباش ئای لەم رۆژە خۆشە دراوسێ لەخەو راپەریوە وەك مەترەلێوز دەتەقێ‌و دەڵێت: رۆژباش ! ئایا نازانیت کات ژمێر چەندە ؟
کابرا دەڵێت: (٢/٣٠پاش نیوەشەوە.)
ئا نەء وانییە، ئەی‌چۆن؟ سەگەکەت لە باخچەکەی مندایەو دەوەرێت ؟ بڕواناکەم لەکاتێکی وادا بەرەڵای بکەیت.
لەوکاتەوە ئیترسە گەکەی نەوەری.

- گەشتکەرێك پێش گەرانەوەی بۆ وڵاتی خۆی تەلەفزیۆنێك دەکرێت. لێی دەپرسن ئاخوا لە شاری خۆی تەلەفزیۆن نافرۆشن؟
با دەڵێت: بەلاَم بەرنا مەکانی ئێوە زۆر خۆشترو چاکترن.

ماموستایەك زۆری هەوڵ دا لەگەڵ قوتابی‌یەك تا دەرسەکەی تێ‌گەیاند جا رووی تێ‌کرد وتی: من نەبوومایە تۆ هەر یەکەم ئەبووی لە کەریەتیدا لەم ژورەدا. قوتابی‌یەکان هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین ئەو کاتە ماموستا هەستی کرد چی وتووە!



کاتی تۆماس ئەدیسۆن یەکەم پاڵێوگە؟ مصفی)ی کردەوە دی گشت ئیش کەرەکان هەمیشە سەیری کات ژمێری سەر دیوارەکە دەکەن.

ئەدیسۆن ئەمەی لا ناخۆش بوو بەلاَم هیچی نەوت. شەش حەوت کات ژمێری تری هێناو هەریەکەی خستە سەر کاتێك و لە لایەکی هەڵواسیی پاش ماوەیەك ئیش کەرەکان سەریان لێ‌تێك چوو ئیتر وازیان هێنا لە سەیر کردنی کات ژمێر

## زمانی دار و درەخت

کۆمەڵێك لێکۆڵەرەوەی ئەمریکایی دوای پشکنین و تاقی‌کردنەوەی هەشتا دار گەیشتنە چەند ئەنجامێکی بیر بزوێن.

ئەوەبوو سەرنجیان دا کەوا داران قسە لەگەڵ یەك دەکەن بەلاَم بە هۆی هەندێ ئیشارەتی وەهاوە کە هێشتا کەس پێی نەزانیوە.

بەنموونە سەیریان کرد کە ئەگەر دارێك تووشی دەردێك بێت، خێرا هەڵاڵەکانی خۆی تێ‌دەگەیەنێت، ئەوانیش جۆرە شلەیەك دەردەدەن کە بەرگرییان زیاد دەکات.

وە نزیکە گومان لەوەدا نەمێنی کە داران بە هۆی رەگەوە یەکتر نادوێنن، چونکە زۆر جار دوو دار یەکتریان دواندووە کە ماوەی نێوانیان بیست مەتر زیاتربووە. ئیتر دەبێ بپرسین: داخوا چڵ ولقەکان چۆن لە یەکتر دەگەن و بە چ زمانێك یان بۆنێك یەکتر دەدوێنن؟



چارە نووست لە رەنگینی ئەم مانگەدا

سەرناسی رەنگین



کاور: ـ لە ٢١/٣تا ٢٠/٤

ئەوەی چاوەڕوانی ئەکەیت نایێ، جارێ پەلەمەکە، بە ختت لە ژمارە(٤)دایە

مژدەیەکی خۆش بە رێگاوەیە، زۆرلە خۆت بایی‌مەبە، بەختت لەژمارە (١)دایە.

جووتە ـ لە ٢١/٥تا ٢١/٦

لەم ماوەیەدا ئاگاداری نهێنییە تایبەتیەکانی خۆت بە، بەختت لەژمارە (٢)دایە

بەگوێی لە خۆت گەورە تربکە، لەسەر رای خۆت سورمەبە، بەختت لە ژمارە(٩) دایە.

## وشەی تێك هەڵكێشی

وشـەی تێـك هەڵكێشی ئەم ژمارەیە هاورێی رەنگین كاك رحمن حسین حمـد لە هەولێرەوە بۆی ناردووین زۆر سوپاسی ئەكەین و هیوادارین گشـت خوێنـەران كاتێكی خۆشی لەگەڵ دا بەرنەسەر.



### ستوونی

١- ــــــ.
٢- رەنگێكە.
٣- ــــــ.
٤- جار.
٥- گۆرانی بە بادینی
٦- ــــ.
٧- ــــ.
٨- رما= پ=
٩- ــــ.
١٠- بڵێسە =پ.=
١١- جۆرە سەوزەیەكی شاخیـیە
١٢- ــــ.
١٣- ــــ
١٤- پە لەوەرێكی ئاویـیە.
١٥- ــــ
١٦- گەورەترین زەریایە لە جیهان.

### ئاسۆیی

١- پایتەختی ولاتی سلفادۆر، دلۆپ.
٢- راناوی پرس بۆئەوەی(بێ)، رەوشت.
٣- مێرد
٤- نێرەی مانگا، بەسەر مرۆڤەوەیە،
٥- جۆرێكی دبا‌یە.

### ئەنجامی وشەی تێك هەڵكێشی ژمارە ٣٩



### قـەی هـەق

سەد چاكە بكەی لەگەڵ ناپیاو
كەبێ دڵیت كرد ئەیدا بە ئاوا

**شێر:- لە ٢٣/٧ تا ٢٢/٨**
مەسرەف زۆر مەكـە، دەسـت پێوەبگرە، بەختت لە ژمارە (٣)دایە.

**فەریك - ٢٣/٨تا ٢٢/٩**
دڵی خەڵـك بە خۆرایی مەئێشێنـە، تۆزێ بەسەبربە، بەختت لە ژمارە(١)دایە

**تەرازوو:- ٢٣/٩تا٢٢/١٠**
خاڵی لاوازیی ژیـانی خۆت لای كەس باس مەكە، بەختت لەژمارە (٠)دایە

**دووپشك :- ٢٣/١٠/تا ١١/٢٢**
لەپشتە ملەباسی خەڵكی مەكە، وەك دووپشك مەدەبەخەڵكەوە، بەختت لەژمارە(٧)دایە.

**كەوان:- لە٢٣/١١تا ١٢/٢١**
دوو دڵ ، مەبە، ماوی خوای لێ بهێنە، بەختت لەژمارە (١)دایە.

**كیسـك :-**
لە ٢٢/١٢تا ٢٠/١
خۆشەویستەكەت راستت لەگەڵ ئەكات، بەختت لەژمارە(٥)دایە.

**سەتڵ:- لە٢١/١تا ١٨/٢**
لەم مانگەدا هەرچی ئەڵێی خەڵكی پێیان باشە، بەختت لەژمارە (٨)دایە.

**نەهەنگە:- لە ١٩/٢تا ٢٠/٣**
یارمـەتـی كەس و كاروهـاورێكـانت بدە، بەختت لەژمارە (٦)دایە.

# باخچەی جگەرگۆشەکان





داود قاسم کاکەیی



چنار محمد رؤف محمد



هەژمەت عبدالخالق



مەرام غریب‌لرحمن



تابلۆ عدنان رەباتی



تانیا علي عبدالرحمن



رۆژگار محمد عبدالله



هیوا عبدالرحمن محسن

## جگەرگۆشەکانم ئەم کاتەتان باش



ئەی نێرگزو گوڵی باخانم
ئەی نەوەی داهاتووی ژیانم
ئەم کاتەتان باش . . .

دوێـنـێ ئێـوارە لە قەراغی ڕوبارەکە پیاسەم دەکرد ، لەپڕ بینیم هەندێ لە هاوڕێکانتان خەریکی ڕاوەمـاسی بوون. بێدەنـگ بووم و لە سەرەتادا هیچم پێ نەوتن، بینیم پاش نەختێـك یەکـیەکـە بۆ لام هاتن و وتیان:

:ـ دادە ئێـمـە یاریی خۆمـان دەکـەیـن و ئارەزوومـان لە ڕاوەماسی‌یە منیش پرسیارم لێ‌کردن.

:ـ ئەی سەعی؟!!

بەیەك دەنگە وتیان.

:ـ شەو شەوان سەعی دەکەین.

لەم وەرزەدا بەکـۆمـەڵ بەدیار ڕووبـاره جوانـەکـە بەڕیـز دانیشتن منیش نەختێـك لە دوورەوە ڕاوەستام و هاوارم کردنێ:

ـ نەکـەن بکـەونـە نێـو ڕووبارەکەو بخنکێن ئاوەکەی ساردەو لەشـتـان تەڕ دەبێ‌و نەخۆش دەکەون.

یاریی خۆیـانیـان کرد وئینجا بەردیـان فڕێ دەدایـە نێـو ڕووبارەکە . . هەر ئەوە مابوو سەریـان بشـکێ یاخـود بە شووشـەی بن ڕوبـارەکـە قاچیان برینداربێ.

لە کۆتـاییدا تەمێم کردن کە جارێکی‌تـر لەم وەرزەدا بەم شێوەیە یاری نەکەن، چونکە دەبـێ لە هاویـن و بە ئاگاداری‌یەوە ئەم ئارەزووەیان جێ‌بـەجێ بکـەن، چونکـە قوتـابخـانـە چرای ژیانـەو خۆپاراستن کارێکی زۆر جوانە.

دادە أحلام

## [illegible]ی کاکە حەمەی مەلاکەریم

لە دوا سەعـاتەکانی شەوی دووشـەممەی ۳/۲/۱۹۹۲دا، ماڵی برامـان کاکـەحـەمـەی مامـۆسـتـا مەلاکـەریـم و شیریـن خانی هاوسـەری ، بە دەنگی ناسکی (ئنگا.. ئنگا..)ی کوڕە کۆرپـەیـەکی تازە هاتووە دنیـا، پڕ بوو لە هەراو زەنـای



شاخوان عبدالله محمد



الهام خالد شێروانی



شوان دارا محمد رشید



هەردی عبدالله رحیم



بیگەرد وهاب علی حسین



سيڤەر هوشيار أحمد



هەڵات کريم صالح



گوڤەند، گوڤار سردار رسول



هێشوو صالح مصطفى



لەنجه عبدالرحمن غريب



کوڤان امجد



نيگار



ئامانج کاکه مند



محمد علي حەمه امين



رێبين ئازاد/دەروون انور

شادمانیو، چاوانی (بیارە)ی تا ئەوساتە کچە تاقانەی باوك و دایکی، بە دیداری هاورێو برایەکی بچکۆلانە فرمێسکی پێخۆشحاڵیی تێزا، ساوای چاوان تازە بۆ خەم و خۆشیی ئەم جیهانە هەڵهێناو، بە هیوای ژیانێکی پڕلە پیت وفەر، بە ناوی (ژیوار) بانگی بەگوێدا دراو گوێزەبانەی کوردانەی بۆ کرا.

هیوادارین (ژیوار)ی ئازیز لەژێر سایەی باوك و لە کۆشی دایك و دەست لەناو دەست لەگەڵ (بیارە)ی خوشکی، بە خۆشیو کامەرانی پێبگاو، خزمەتگوزارێکی دڵسۆزی گەل و نیشتمان و مایەی بەخی نەتەوەکەیی لێ دەرچێ.



## شیعر بۆ منداڵان

## سوپاس

سوپاس بۆ بابەو دایە
منیان هێنایە کایە
سوپاسی بێ پایانم
بۆگشت مامۆستایانم
فێری زانینیان کردم
بۆ ئاسۆی ژینیان بردم
کەڵکی زۆریان پێ بەخشیم
هەر لەبیرمن تا بژیم
ژیرم، وریام، نەبەردم
سوپاس منالی کوردم

عبدالکريم باقی امين

## گوڵی باخچە

برادەرانی کاکه حەمه



لينا مشير مصطفى





چنار فەهمی کاکەیی



هاوکار توفيق عبدالله



هێرۆ کامران



نەفرین، پەرژین جميل



بروا کريم مجيد

